# کۆنترۆڵکردنی ڕاگەیاندن

نەعوم چۆمسکی

لە ئینگلیزیەوە : ئیبراهیم حەمەڕەش



# کۆنترۆڵکردنی ڕاگەیاندن

## دەسکەوتە مەزنەکانی پروپاگەندە

نووسینی

**نەعوم چۆمسکی**

وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە

**ئیبراهیم حەمەڕەش**

Noam Chomsky,"Media Control: The Spectacular Achievements of Propaganda",( in Kurdish)

# کۆنترۆڵکردنی ڕاگەیاندن
## دەسکەوتە مەزنەکانی پروپاگەندە

نووسەر: پرۆفیسۆر نەعوم چۆمسکی، پرۆفیسۆری زمان لە پەیمانگای ماساشوتس بۆ تەکنۆلۆجیا، ئێم ئای تی.

وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە: پرۆفیسۆر ئیبراهیم حەمەڕەش، پرۆفیسۆری ئەندازیاریی لە زانکۆی سەلاحەدین-هەولێر



بابەت: فەلسەفە، سیاسەت و ڕاگەیاندن
بلاوکردنەوە: مالی وەفایی، هەولێر
تیراژ: 1000دانە
چاپخانە: ماردین، هەولێر
دیزاینی بەرگ: ئەحمەد نەبەز

کۆدی وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان: ژمارە 126، ساڵی 2018

بەرگی ناوەوەی کتێبە ئینگلیزیەکە

# The Spectacular Achievements of Propaganda

SECOND EDITION

NORM CHOMSKY

AN OPEN MEDIA BOOK

SEVEN STORIES PRESS / New York



"The Journalist from Mars" originally appeared in the July/August 2002 edition of *EXTRA!*, the magazine of Fairness and Accuracy in Reporting (FAIR). For more information see: www.fair.org

An Open Media Book.
Series editor, Greg Ruggiero.



ISBN: 1-58322-536-6

9 8 7 6 5 4 3 2 1

Cover design and photo by Greg Ruggiero.

Printed in Canada

# پێشەکی

نووسینە هزری و سیاسیەکانی نەعوم چۆمسکی جگە لەوەی بیرن، دەقی ئەدەبیشن، بۆیە من هەوڵم داوە لەم وەرگێڕانەدا شێوازی چۆمسکی بگوازمەوە، بە تایبەتیش کە ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا دوو موحازەرەی بەناوبانگی چۆمسکین کراون بە کتێب، چۆمسکی بۆ چ ئاستێکی ڕۆشنبیری لەوێ قسەی کردووە، منیش بۆ ئەو ئاستەم لێرە وەرگێڕاوە. نەعوم لەم کتێبەدا بە ستایلی تەنزئامێز و تەوس و کینایە قسە دەکا، منیش وەکو خۆی دامناوەتەوە و بۆ تێگەیشتن متمانەم بە خوێنەر هەبووەو هیچ شتێکم لەناو کەوانە ڕوون نەکردۆتەوە، تەنها بۆ ئەوەی سوودی پتر بێت، ژێدەرم بۆ کتێبەکە زیادکردووەو بۆ زمانی وەرگێڕانەکە داواکاری لەفزی گران و بەستوبەیان نەبووم.

من ئەم کتێبەم بە مەبەست لەوکاتەی مێژووی گەلەکەمان کرد بەکوردی، چونکە باسی پیشەسازی دروستکردنی کۆدەنگی و ئاڕاستەکردنی ڕایگشتی دەکا، کە ساڵانە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا سەدان ملیۆن دۆلای بۆ تەرخان دەکرێ، وا خەریکە ئەم پیشەسازیە لە کوردستانیش برەو دەستێنێ، هەم دوژمنانمان خەریکین هەم خۆشمان. وەکو چۆمسکی دەڵێ، ئەم میللەتە دەبێ بزانێ کە چ جۆرە دیموکراسیەک و چ جۆرە ئازادیەک و چ جۆرە کۆمەڵگایەک دەخوازێ کە تێیدا بژی. ئەم کتێبە هەوڵێکە بۆ ئەم تێگەیشتنە.

**پرۆفیسۆر ئیبراهیم حەمەڕەش**

**زانکۆی سەلاحەدین،هەولێر، 2018**

# دەسکەوتە مەزنەکانی پروپاگەندە

ئەو ڕۆڵەی کە ڕاگەیاندن لە سیاسەتی هاوچەرخ دەیگێڕێت وامان لێدەکات کە بپرسین ئایا ئێمە دەمانەوێت لە چ جیهانێک و لە چۆن کۆمەڵگایەک بژین، هێشتا تایبەتتر، دەخوازین بە چ شێوە دیموکراسیەک کۆمەڵگایەکی دیموکراتیک بێ؟ با من لێرە بە خستنەڕووی دوو تێگەیشتن لە دیموکراسی دەسپێبکەم. یەکێک لە تێگەیشتنەکان لە دیموکراسی بریتیە لەوەی کە کۆمەڵگای دیموکراتیک ئەو کۆمەڵگایەیە کە کۆمەلانی خەڵک دەزگا و کەرسەتە و ئەسبابیان لەبەردەستدایە بۆ ئەوەی بە جۆرێک لە جۆرەکان و بە شێوەیەکی شایان بەشداری لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان بکەن و کەرەستە و سەرچاوەکانی زانیاریش کراوەیەو ئازادە. ئەگەر

ئێوە بۆ پێناسەی دیموکراسی سەیری فەرهەنگ بکەن ئەوا پێناسەیەکی لەو شێوەیەتان دەسدەکەوێت.

تێگەیشتنی بەرامبەر لە دیموکراسی ئەوەیە کە پێویستە لینەگەڕێندرێ کۆمەلانی خەلک بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان بکەن و دەزگا و کەرەستەی زانیاریش بەرتەسک بکرێت و زۆر بە توندی کۆنترۆل بکرێت. ئەمە بە تێگەیشتنێکی سەیر لە دیموکراسی خۆی پیشاندەدا، بەلام گرنگە ئەوە تێبگەین کە ئەوەیان تێگەیشتنی زاڵە. لە ڕاستیدا، ئەمەیان نەک هەر زۆر لە ڕایەکردن بەکارهاتووە، بەلکو بنەمایەکی تیۆریشی هەیە. مێژوویەکی دوورودرێژ هەیە، دەگەڕێتەوە بۆ شۆڕشە سەرەتاییەکانی دیموکراسی نوێ لە ئینگلتەرای سەدەی حەڤدەم کە زۆر ئاوێنەی ئەم تێڕوانینەیە. بەلام من تەنها باسی سەردەمی نوێ دەکەم و چەند ووشەیەک دەلێم دەربارەی کە چۆن ئەم تێگەیشتنە لە دیموکراسی گەشە دەکا و بۆچی و چۆن گیروگرفتی ڕاگەیاندن و

شاردنەوەو شێواندنی زانیاری تێکەڵی ئەم بابەتە دەبێت.

## مێژووە سەرەتاییەکانی پروپاگەندە

لە سەرەتادا، با بە یەکەم کردەوەی پروپاگەندەی میری لەسەردەمی نوێ دەسپێبکەین. ئەوە لە کاتی سەرۆکایەتی ودرۆ ویڵسن بوو[1]. ودرۆ ویڵسن لە ساڵی 1916 و لە ژێر دروشمی بانگەوازی هەڵبژاردنەکەی کە بریتیبوو لە "ئاشتی بەبێ سەرکەوتن" بە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا هەڵبژێردرا. ئەمە لە ناوەڕاستی شەڕی جیهانی یەکەم بوو. کۆمەڵانی خەڵک لەوکاتەدا تا ئەوپەڕی ئاشتیخوازبوون و هیچ هۆیەکیان نەدەدیت پێویست بکا خۆیان لە شەڕێکی ئەوروپایی هەڵقورتێنن. بەڵام ئیدارەی ویڵسن پابەند بوو

---

[1] ودرۆ ویڵسن (1856–1924 ز) سەرۆکی بیست وهەشتەمی ئەمەریکا بوو لە نێوان ساڵانی 1913 تا 1921، لە پارتی دیموکراتەکان بوو.

بەشەڕ و دەبوایە شتێک بۆ ئەوە بکا. ئەوان کۆمسیۆنێکی پروپاگەندەی حکومیان دامەزراند و ناویان لێنا کۆمسیۆنی کریل[2]. ئەم کۆمسیۆنە لەماوەی شەش مانگدا سەرکەوتوو بوو لە وەرچەرخاندنی جەماوەرێکی ئاشتیخواز بۆ جەماوەرێکی هیستیریاگرتوو بۆ شەڕ و شەڕخواز کە داوایان دەکرد هەرچی ئەڵمانیە خاپووری بکەن و ئەڵمانەکان پارچە پارچە بکەن و بچنە ناو شەڕەکە و جیهان ڕزگار بکەن. ئەمە سەرکەوتنی هەرە گرنگ بوو و سەرکەوتنی زۆرتریشی بەدوای خۆی هێنا. هەر لەهەمانکاتدا و لە دوای شەڕەکە، هەمان تەکنیک بەکارهێندرایەوە بۆ قینکردنەوەی هیستیریای خەتەری سۆر (ترسی شیوعی) وەکو وایان پێدەگوت، کە ئەوەش لە تێکدانی یەکێتیەکان (مەبەست سەندیکا کرێکاریەکانە) و لەناوبردنی گیروگرفتی ترسناکی

---

[2] کۆمیتەی زانیاری جەماوەری یان سی پی ئای ، ئاژانسێکی سەربەخۆی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو لەساڵی 1917 بۆ گۆڕینی ڕایگشتی لە ئەمریکا لە ساڵانی شەڕی جیهانی یەکەم دامەزرا. لە 21ی ئابی 1919 کاری تەواو بوو و قەپات کرا.

وەک ئازادی میدیا و ئازادی بیروباوەڕی سیاسی سەرکەوتنی باشی بەدەستهێنا. بۆ سەرگرتنی ئەم کارەش، پشتیوانیەکی بەهێزیان لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن هەبوو، هەروەها پشتیوانی دەزگای بزنسمانەکانیشیان هەبوو، کە لە ڕاستیدا هەر ئەوان بوون زۆربەی ئەم کارەیان ڕێکخستبوو و هانیان دابوو. بەشێوەیەکی گشتی ئەوە سەرکەوتنی مەزن بوو.

لەناو ئەوانەی کە زۆر بە چالاکی بەشداری شەڕی ویلسنیان کرد بیرمەندە پێشکەوتنخوازەکان بوون، ئەو کەسانەی کە لە بازنەی دویی بوون[3]. ئەوانە شانازیان بەوە دەکرد ، وەکو لە نووسینەکانیان لەو سەردەمە دیارە، کە ئەوان بوون ئەو کەسانەیان دۆزیەوەو هێنا پێشەوە کە پێیان دەگوترێت "ئەندامە خوێندەوارەکانی کۆمەڵگا"، هی وەکو خۆیان، کە

---

[3] جۆن دویی(1859–1952 ز) فەیلەسوف و سایکۆلۆجیست و ریفۆرمکارێکی ئەمەریکایی بوو، ڕای تایبەتی هەبوو بۆ دیموکراسی و بە ڕایگشتی گرێی دەدا.

دەتوانن جەماوەری ڕاڕا بەرەو شەڕ باژۆن، ئەویش بەهۆی تۆقاندنیان و جۆشدانی هەستی نەتەوایەتی تیایاندا بە بەکارهێنانی هەموو کەرەستە بەردەستەکان کە لەبن نەدەهاتن. بۆ نموونە خولْقاندن و ڕازاندنەوەی کۆمەڵکوژی لەلایەن ئەڵمانیە هەنەکانەوە[4]، منداڵە بەلجیکیەکان کە دەستوقاچیان بڕابوونەوە، جۆرەها کردەوەی ئازاربەخش و قێزەوەن کە تا ئێستا لە کتێبە مێژوویەکان دەخوێندرێنەوە، بەشی زۆری ئەوانە لەلایەن وەزارەتی پروپاگەندەی بەریتانی داهێنرابوون. کاری ئەو کەسانە وەک لە ڕاپۆرتە نهێنیەکانیان هاتووە ئەوەبووە "ئاراستەکردنی مێشکی بەشی زۆری جیهان"، بەڵام کاری لەپێشتری ئەوان ئەوە بوو کە هزرو بیری ئەندامە خوێندەوارەکانی کۆمەڵگا لە وڵاتە یەکگرتووەکان

---

[4] هەن گەلێکی کۆنی ئەوروپای ڕۆژهەڵات بوون لە مێژوودا، لەبەر کارە دڕندەکانیان کە مێژوو باسی دەکا، لە کاتی شەڕی جیهانی دووەم دا لە ڕاگەیاندنەکانی ڕۆژئاوا ئەم وشەیە وەک شۆرەت بۆ ئەڵمانە نازیەکان بەکار دەهێندرا.

دەستەمۆ بکەن، ئەوانەی کە لەدواییدا وەکو پلانیان بۆ دارِشتبوو، پروپاگەندەکان بڵاودەکەنەوە و وڵاتێکی ئاشتیخواز وەردەچەرخێنن بۆ وڵاتێکی شەرِخواز ، ئەو کارەش ئامانجی خۆی پێکا و زۆر باشیش سەریگرت. وانەیەکیشی فێرکردین: پروپاگەندەی حکومی ئەگەر لەلایەن چینی خوێندەوار پاڵپشتی بکرێ و ئەگەر سنووربەندیش کرابێ، دەکرێ کاریگەری زۆری ببێ. دەرسێک بوو هیتلەر و زۆرانی دیش لێی فێربوون و تا رِۆژگاری ئەمرِۆش دێتەبەکارهێنان.

## دیموکراسی تەماشاکەر

گروپێکی تر کە بەو سەرکەوتنانە مەستبوون تیۆرخوانە لیبرالە دیموکراتەکان و کەسایەتی میدیاکاری ناوداری وەک واڵتەر لیپمان[5] بوون.

---

[5] واڵتەر لیپمان (1988-1974 ز) نووسەرو ستوونووس و شرِۆڤەکارێکی سیاسی ئەمەریکایی بوو. یەکێکە لەو کەسانەی کە زوو

والتەر ئەستوندەی ڕۆژنامەگەری ئەو سەردەمی ئەمەریکا بوو، یەکێکە لە شیکەرەوەکانی سیاسەتی دەرەوەو ناوەوەو و یەکێکە لە سەرەکیترین تیۆریستی دیموکراسیی لیبرال. ئەگەر وتارە کۆکراوەکانی دەور بکەنەوە بۆتان دەردەکەوێت کە ناونیشانی لە بابەتی "بیردۆزێکی پێشکەوتنخواز بۆ هزری لیبرالی دیموکراسی" هەیە. لیپمان هەروەها لە کۆمیتەکانی پروپاگەندە تێوەگلابوو و ڕێزی بۆ دەسکەوتەکانی دادەنا. ئەو دەمەتەقێی ئەوەی هێناکایەوە کە ناوی لێنابوو "شۆڕش لە هونەری دیموکراسیدا" کە دەکرێ بکرێتە ئامێری دروستکردنی "کۆدەنگی". بەو واتایەی، لە ڕێگای تەکنیکە نوێیەکانی پروپاگەندەوە، ڕایگشتی والێبکرێت بە پرسێک ڕازیبێت کە پێشتر پێی ڕازی نەدەبوو . ئەو هەروەها بڕوای وابوو کە ئەمە بیرۆکەیەکی نەک هەر باش بوو بەڵکو پێویستیش بوو. پێویست بوو

---

دەستەواژەی شەڕی ساردی بەکار هێنا. کتێبێکی بەناوبانگی دەربارەی ڕایگشتی لە ساڵی 1922 نووسیوە.

چونکە وەک ئەو نووسیبووی: "بەرژەوەندی گشتی بەتەواوی ڕایگشتی دەگەوجێنێ". ئەوەش تەنها "چینێکی پسپۆر" لێی تێدەگەن و بەوان بەڕێوەدەبردرێ لە " پیاوانێک کە هەست بە لێپسراوەتی دەکەن" کە بایی ئەوە زیرەکن شتەکان لە جێگای خۆیان دابنێن. ئەم تیۆریە تەکەز لەوە دەکاتەوە کە تەنها نوخبەیەکی بچوک، ئەو خەڵکە خوێندەوارەی کە پێشتر دوێیەکان باسیان دەکرد، لەو ئاستەن کە لە بەرژەوەندی گشتی تێبگەن، بەرژەوەندی گشتیش ئەو شتەیە کە لەلای هەموو خەڵک گرنگە، ئەو شتانەی کە "ڕایگشتی لەخشتە دەبەن". ئەم تێگەیشتنە بۆ سەدان ساڵی پێشتر دەگەڕێتەوە. ئەمە دیدێکی نموونەیی لینینیشە[6]. لە ڕاستیدا ئەمە زۆر نزیکە لەو دیدوبۆچوونەی لینین کە دەڵێ سەردەستەی هزرمەندە شۆڕشگێڕەکان دەگەنە دەسەڵات، ئەوان شۆڕشە جەماوەریەکان

---

[6]ڤلادیمیر لینین (1870–1924 ز)، شۆڕشگێڕی کۆمۆنیست و تیۆریستی سیاسی و سەرکردەی شۆڕشی ئۆکتۆبەری روسیا.

وەکو ئەو هێزە بەکاردێنن کە دەیانگەیەنێە دەسەڵات و لە پاشان جەماوەرە نەفامەکە بەرەو داهاتوویەک داژۆن کە ئەوان لەو ئاستەدانین بۆخۆیان تێی بگەن. تیۆریەکانی دیموکراتیکی لیبرال و مارکسیزم-لینینیزم لە لایەن گریمانە ئایدۆلۆجیە هاوبەشەکان زۆر لەیەکەوە نزیکن . من لەو باوەڕەدام ئەوە یەکێکە لە هۆکارەکان کە بۆچی مرۆڤ بە ئاسانی سەنگەر دەگۆڕێت بێ ئەوەی هەست بەو گۆڕانەش بکات. ئەوە تەنها مەسەلەی ئەوەیە کە هێز و توانا لە کوێیە. لەوانەیە شۆڕشێکی جەماوەری ڕوویدا کە ئێمە بگەیەنێتە دەسەڵات یان ڕەنگە ئەو شۆڕشە هەر ڕوونەدات، لە هەر حاڵەتێکیان بێ ئێمە هەر بۆ ئەوانە کار دەکەین کە هێزی ڕاستەقینەیان هەیە: کۆمەڵگای بزنس. بەڵام ئێمە هەمان شت دەکەین، ئێمە جەماوەرە نەفامەکە بەرەو جیهانێک لێدەخوڕین کە ئەوان زۆر لەوە کاڵفامترن کە بۆخۆیان تێبگەن.

لیپمان به بیردۆزێکی تێروتەسەل بۆ دیموکراسی پێشکەتنخواز پاڵپشتی ئەوەی سەرەوەی کرد. ئەو دیبەیتی ئەوەی دەکرد کە لە دیموکراسیەکی تەندروستدا ، چینی جودای هاونیشتیمانیان هەن، لە پێش هەمووانداا، چینێک لە هاونیشتیمانیان هەن کە پێویستە هەندێ ڕۆڵی کارا لە بەڕێوەبردنی کاروباری گشتیدا ببینن، ئەوە چینی پسپۆرە، ئەوانە ئەو خەڵکانەن کە شت لێکدەدەنەوە، جێبەجێدەکەن، بڕیار دەدەن و شتەکان لە چوارچێوە سیاسی و ئابووری و ئایدیۆلۆجیەکاندا بەڕێوە دەبەن. ئەمە ڕێژەیەکی کەمی دانیشتوانە. بە شێوەیەکی سروشتی هەرکەسێک ئەم بیروڕایانە بکاتە ئامانجی خۆی، ئەوا بەشێکە لەو گروپە بچوکە، ئەوانە لەوە دەدوێن کە چی لەوانی تر بکەن. "ئەوانی تر" کە لە دەرەوەی ئەم گروپە بچوکەن، کە زۆرینەی دانیشتوانن، ئەوانەن کە لیپمان ناوی لێناون "مێگەلی سەرلێشێواو" و دەڵێ پێویستە ئێمە خۆمان لە "بۆڕەو بندەستوپێکەوتنی مێگەلە سەرلێشێواوەکە"

بپپاریزین. ئیستا دوو "کار" له دیموکراسیدا هەیە:
چینی پسپۆر، مەسولەکان، کاری جێبەجێکردن
ئەنجام دەدەن، واته ئەوان بیردەکەنەوە، پلان
دادەڕێژن و له بەرژەوەندی گشتی تیدەگەن. ئنجا له
پاش ئەوانە، مێگەلی سەرلێشێواو دێ. ئەوانیش
کارێکیان له دیموکراسی هەیە، ئەو دەڵێ کاری
ئەوانه ئەوەیه ببن به "تەماشاکەر" نەک بەشداربووی
ڕوداوەکان. بەڵام چونکه دیموکراسیه، ئەوا مێگەلی
سەرلێشێواو کارێکی تریشیان هەیە. ناوبەناو
بواردەدرێ که پشتگیری ئەندامێکی چینی پسپۆر
بکەن، به واتایەکی دی، ئەوان ڕێگایان پێدەدرێ که
بڵێن "ئێمه دەمانەوێت تۆ ببیت به سەرکردەمان" ئەوە
چونکه ئێرە وڵاتێکی دیموکراسیه نەک تۆتالیتاری.
ئەمه پێی دەگوترێت هەڵبژاردن. بەڵام هەرکه ئەوانه
پاڵپشتی یەکێکیان لەوان کرد، له چینی پسپۆر،
پێویسته بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان و ببنەوە
تەماشاکەری ڕوداوەکان نەک بەشداربووی

ڕوداوەکان. ئەمە لە دیموکراسییێکی باش کارکردوودا ڕوودەدا.

ئنجا ژیربێژیەک لەپشت ئەوە هەیە، جۆرە ڕەوشتێکی بەرز لە پشت ئەوە هەیە. ئەو ڕەوشتە بەرزە ئەوەیە کە زۆرینەی کۆمەلانی خەڵک لەو ئاستە کەمترن لە شتەکان تێبگەن، بۆیە ئەگەر ئەوان هەوڵبدەن بەشداری بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان بن تەنها تەنگوچەڵەمە دروستدەکەن. بۆیە ئەوە کارێکی نائەخلاقیە بۆ ئێمە کە ڕێگا بەوانە بدەین کە ئەمە بکەن. ئێمە پێویستە مێگەلە سەرلێشێواوەکە ماڵیی بکەین، نەک ڕێگا بدەین مێگەلەکە کێوی ببێ و هەموو شتەکان بخاتە بندەستوپێی خۆی وخاپووریان بکا. ئەمە بەو لۆژیکە پێوانەدەکرێ کە ناکرێ منداڵێکی تەمەن سێ ساڵان بەتەنها لە شەقامێک بپەڕێتەوە. چونکە ئێوە کەستان ئەوەندە ئازادی نادەن بە منداڵێکی سێ ساڵان ، چونکە منداڵی سێ ساڵان نازانێ چۆن ئەو ئازادیە بەکاربێنێ. بەهەمان

ئەو لۆژیکە، ئێوە رێگانادەن کە مێگەلەکە ببێتە بەشداربوو لە ڕووداوەکان. چونکە ئەوان تەنها تەنگوچەڵەمە دروست دەکەن.

لەوکاتەدا ئێمە ڕێگایەکمان دەوێ کە مێگەلە سەرلێشێواوەکەی پێ ماڵیی بکەین، ئەوڕێگایەش ئەو شۆڕشە نوێیەیە لە هونەری دیموکراسیدا: "دروستکردنی کۆدەنگی".ڕاگەیاندنەکان، قوتابخانەکان و ڕۆشنبیری جەماوەری پێویستە پەرت بکرێت. چینی سیاسی و بڕیاربەدەستەکان پێویستە هەندێک هەستکردن بە ڕاستیان پێبدەن، لەهەمانکاتدا پێویستە بیروباوەڕی گونجاویان لە مێشک بڕوێنن. بەبیرتانبێتەوە، لێرە فەرەزیەیەکی ڕانەگەیەندراو هەیە. فەرەزیە ڕانەگەیەندراوەکە –پیاوە لێپسراوەکان پێویستە ئەمە لەخۆشیان بشارنەوە– دەربارەی ئەو پرسیارەیە کە ئەوان چۆن دەگەن بەو پلە و پایەی کە دەسەڵاتیان پێدەبەخشێ تا بتوانن بڕیاربدەن؟ ئەو ڕێگایەی ئەوان دەیگرنەبەر بریتیە لە

خزمەتكردنی ئەو كەسانەی هێزیان هەیە. مرۆڤی خاوەن هێزی ڕاستەقینە ئەوانەن كە كۆمەڵگایان لەژێر دەستە، ئەوانەش گروپێكی بچوكن. ئەگەر چینی پسپۆر بێ و بڵێ، من دەتوانم خزمەتی بەرژەوەندیەكانتان بكەم ، ئەوا دەبن بە چینی جێبەجێكەر. ئەمە پێویستە بە كرێ ئەنجام بدرێ. ئەوە مانای وایە ئەوان پێویستە ئەو بیروباوەڕ و دۆگمایەی كە خزمەتی هێزی تایبەت دەكا لە مێشكی ئەوانەیان چەقاندبێ. تا ئەوكاتەش كە ئەوانە لەو خزمەتانە شارەزایی پەیدا نەكەن، ئەوا نابن بە بەشێك لە چینی پسپۆر. بەمجۆرە ئێمە تەنها یەك جۆرە سیستەمی فێركردنمان هەیە ئەویش ڕووی لە چینی پسپۆرە. ئەوان پێویستە بە قووڵی بە بەهاو بەرژەوەندیەكانی هێزی تایبەت و تۆڕەكانی نێوان كۆمپانیا و دەوڵەت تەڵقین بدرێن. ئەگەر ئەوان بتوانن ئەمە بەدەست بێنن، ئەوكات ئەوان دەتوانن ببن بە بەشێك لە چینی پسپۆر. ئەوەی دەمێنێتەوە لە مێگەلە سەرلێشێواوەكە هەر ئەوەیە كە لە

بنەڕەتدا پێویستە پەرتەوازە بکرێن. مێشکیان بەشتی تر خەریک بکرێ، لە گیروگرفت دووربخرێنەوە. تا دڵنیادەبن کە جێگایان لەناو تەماشاکەرانی ڕوداوەکە دەپارێزرێت، ناوبەناویش پشتی یەکێک لە سەرکردە ڕاستەقینەکان دەگرن کە دەتوانن لەناو کۆمەڵێکیان ئەو هەڵبژێرن.

ئەم تێڕوانینە لەلایەن زۆر خەڵکی دی باسکراوە. لە ڕاستیدا تێڕوانینێکی زۆر تەقلیدیە. بۆ نموونە سەرکردەیەکی ناسراوی لاهووت و ڕەخنەگری سیاسەتی دەرەوە، راینۆڵد نێیبور[7] کە بە "لاهوتیی دەزگای دەسەڵات"و سەردەستەی هزرمەندەکانی سەردەمی جۆرج کینان[8] و کەنەدی[9] ناوزەد دەکرێ،

---

[7]راینۆڵد نێیبور (1892–1971 ز) تیۆلۆجیزان (لاهوتی) وچاودێری سیاسی و کاروباری گشتی ئەمەریکاییە. نووسینی زۆری دەربارەی ئایین و سیاسەت و کاروباری گشتی نووسیوە. مەدالیای سەرۆکایەتی بۆ ئازادی لە ساڵی 1964 پێ بەخشراوە.

[8]جۆرج کینان (1904–2005 ز) باڵیۆزی ئەمەریکا لە یەکێتی سۆڤیاتی جاران، گەلێک لە وردەکاری پلانەکانی سۆڤیاتی ئاشکراکرد. تەکلیفکرابوو بە ڕاگرتنی فراوانبوونی شیوعیەت لە

وایگوت: "ئاقڵمەندیی بەهرەیەکی زۆر دەگمەنە و تەنها خەڵکێکی کەم هەیەتی". زۆربەی خەڵک بە دوای سۆز و کاردانەوەی خێرا دەکەون. ئەوانەی لە ئێمە کە ئەو ئاقڵمەندیەیان تێدایە پێویستە "وەهمی پێویست" بخوڵقێنن و سۆزی "زۆر سادەکراو" دابهێنن بۆ ئەوەی مرۆڤە کاڵفامەکان هەرەتە نەبن و کەم یان زۆر وەکو خۆیان بمێننەوە. ئەوە بوو بە بابەتێکی سەرەکی سیاسەتزانیی هاوچەرخ. لە بیستەکان و سەرەتای سییەکان دا، هارۆڵد لاسوێڵ[10]، کە دامەزرێنەری بواری پەیوەندیەکانی نوێیە، یەکێکە لە سیاسەتزانەکانی پێشەنگی ئەمەریکا، ڕوونیکردەوە کە ئێمە بەرامبەر "دۆگماتیزمە دیموکراسیەکان

---

ڕۆژانی شەڕی سارددا. یەکێک لەو پیاوانە بوو کە لە ئەمەریکا بە حەکیم ناودەبران.

[9]جۆن کەنەدی (1917–1963 ز)، سەرۆکی سی و پێنجەمی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا.

[10]هارۆڵد لاسوێل (1902–1978 ز) سیاسەتزانێکی ئەمەریکایی پێشەنگە. پرۆفیسۆری زانکۆی ییڵ بووە. نووسینی گرنگی دەربارەی ئەنترۆپۆلۆجی، ئابووری، یاسا، فەلسەفە، سایکۆلۆجی و کۆمەڵناسی نووسیوە. لە ناوەندە ئەکادیمیەکان لە ئاستی فەیلەسوفە کلاسیکیە یۆنانیەکان دادەندرێ.

دەربارەی کە پیاو باشترین هەڵسەنگێنەری بەرژەوەندیەکانی خۆیەتی" پێویستە خۆبەدەستەوە نەدەین، چونکە وا نیە. ئێمەین باشترین هەڵسەنگێنەرین بۆ بەرژەوەندیە گشتیەکان. کەواتە، لە ڕووی ڕەوشتیەوە، ئێمە پێویستە دڵنیابین لەوەی کە ئەوان ئەو فرسەتەیان نابێت لەسەر بنەمای خەرەت-هەڵسەنگاندنی خۆیانەوە کار بکەن. ئەنجامدانی ئەوکارە لەژێر سایەی ئەوەی کە لەسەردەمی ئێستادا پێی دەگوترێت دەوڵەتی تۆتالیتاری یان دەوڵەتی سەربازگەری کارێکی ئاسانە. تۆ تەنها پێویستت بە قامچیەک هەیە لەسەر سەریان بەرزبکەیتەوە، هەرکە لە هێڵەکە لایان دا، بکێشە بە سەریاندا. بەڵام کە کۆمەڵگا ئازادتر و دیموکراسیتر دەبێ، تۆش ئەو توانایەت نامێنێ. لەو کەشوهەوایەدا پێویستە بچیتە سەر تەکنیکی پروپاگەندە. بیرۆکەکە ئاشکرایە، پروپاگەندە لە دیموکراسیدا هەمان کاری قامچیەکە دەکا لە دەوڵەتی تۆتالیتاریدا. ئەمەش حیکمەتی تێدایە چونکە دیسان

بەرژەوەندی گشتی مێگەلە سەرلێشێواوەکە دەگەوجێنێ، ئەوان ئەو کەینوبەینە تێناگەن.

## پەیوەندیە گشتیەکان

ولاتە یەککگرتووەکان پێشەنگی پیشەسازی پەیوەندیە گشتیەکانە. هەروەک سەرکردەکانیان دەریدەبڕن ئەوە بۆ "کۆنترۆڵکردنی مێشکی خەڵکە عامەکەیە". ئەوان لە سەرکەوتنەکانی کۆمسیۆنی کریل زۆر فێربوون، هەروەها سوودیان لە داهێنانی "خەتەری سۆر" و ئەوانەی بەدوای ئەوەدا هاتن وەرگرت. پیشەسازی پەیوەندیە گشتیەکان لەوکاتەدا زۆر فراوان بوو. لە بیستەکان، بۆ ماوەیەک لە خستنە ژێرباری کۆمەلانی خەڵک بۆ ڕێساکانی بزنس سەرکەوتوو بوون. ئەمە ئەوەندە لە قەدی خۆی تێپەڕیکرد تا وای لە کۆمیتەکانی کۆنگرێس کرد لەوکاتەی بەرەو سالانی سی دەچوون، دەست بە لێکۆڵینەوە بکەن.

زۆربەی زانیاریەکانمان لە کاری ئەو کۆمیتانە سەرچاوەی گرتووە.

پەیوەندیە گشتیەکان پیشەسازیەکی زلە. ئێستا ئەوان سالانە بلیۆن دۆلاری تێدا خەرج دەکەن، هەموو کاریشیان کۆنترۆلکردنی مێشکی جەماوەرە. لە سیەکان، هەمدیسان وەک پێشتر لە سالانی شەڕی جیهانی یەکەم، گیروگرفتی گەورە سەریانهەلدا؛ قەیرانی مەزن و گیروگرفتی خۆڕێکخستنی کرێکاری. لە ڕاستیدا، لە 1935 بزووتنەوە کرێکاریەکان یەکەم سەرکەوتنی یاساییان تۆمارکرد، ئەویش مافی خۆڕێکخستن لە ڕێگای یاسای واگنەر[11]بوو. ئەمە دوو گیروگرفتی جددی هێنا پێشەوە. یەکەمیان، ئەوەتا دیموکراسی کاری خۆی بە هەلە ئەنجام دەدا. مێگەلە

---

[11]یاسای واگنەر (یاسای پەیوەندیە کرێکاریە نیشتیمانیەکان) لە سالی 1935 لە ولاتە یەکگرتووەکان دەرچوو کە ماف دەداتە کارمەندانی کەرتی تایبەت خۆیان لە یەکێتیەکانی کرێکاری و بازرگانی ڕێکبخەن بۆ ئەوەی داوای باشترکردنی هەلومەرجی کارو ژیانیان بکەن. بە ناوی سیناتۆری نیۆیۆرک رۆبەرت واگنەر(1877-1953 ز) ناونراوە.

سەرلێشێواوەکە بە شێوەیەکی ڕاستەقینە سەرکەوتنی یاسایی دەباتەوە، کە نەدەبوایە بەم جۆرە کار بکات. دووەمیشیان ئەوەبوو کە ئەوەتا خەڵک دەتوانن خۆیان ڕێکبخەن. خۆی خەڵک پێویستە یەکڕیز نەبن، لێکترازاو بن و تەنیا بن. ئەوان نابێ ڕێکخراوبن، چونکە لەم حاڵەتەدا لە تاماشاکەری ڕوداوەکان تێدەپەڕێنن. ئەگەر خەڵکێکی زۆر بە سەرچاوەی کەمیش، بەیەکەوە کار بکەن و بێنە گۆڕەپانی سیاسەتکردن، لەوانەیە ببن بە بەشداریکەر لە ڕوداوەکان. ئەمە بەڕاستی ترس دروستدەکا. کاردانەوەی سەرەکی لەلایەن بزنسەوە هات تا دڵنیابن کە ئەمە دوا سەرکەوتنی یاسایی بزووتنەوەی کرێکاری دەبێ و ئەمە سەرەتای کۆتایی لادانی دیموکراسی دەبێ لە ڕێکخستنە جەماوەریەکان. ئەمە سەریگرت. ئەوە دوا سەرکەوتنی تەڤگەرە کرێکاریەکان بوو- هەرچەندە ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵەو یەکێتیەکان لە کاتی شەڕی جیهانی دووەم بەرەوژۆر چوون پاشان ژمارەکان بەرەو ژێر بوونەوە

– بەلام بواری کارکردن لە ڕێگای یەکێتیەکان بەبەردەوامی لەکورتی دەدا. ئەمە بە ڕێکەوت نەبوو. ئێمە باسی کۆمەڵگای بزنس دەکەین، کە پارەیەکی زەبەلاح و گرنگیدانێکی زۆر و بیرکردنەوەی تەواو تەرخان دەکا کە چۆن لە ڕێگای پیشەسازی پەیوەندیە گشتیەکان و ڕێکخراوەکانی تر هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم گیروگرفتانە بکات، لەو نموونانەش، ڕێکخراوی نیشتیمانی بەرهەمهێنەران، مێژگەردی بزنس و شتی لەو بابەتانە. ئەوانە دەمودەست خرانەگەڕ بۆ ئەوەی هەوڵبدەن ڕێگایەک بدۆزنەوە تا بەر بەو لادانە دیموکراسیانە بگرن.

یەکەم تاقیکردنەوە دوای یەک ساڵ لە 1937هات. لەو ساڵە مانگگرتنێکی گەورە ڕویدا، مانگرتنی کرێکارانی ئاسن لە ڕۆژاوای پەنسلڤانیا لە جۆنزتاون. بۆ تێکدانی بەرەی کرێکاران ، کۆمەڵگای بزنس تەکنیکی نوێی تاقیکردەوە کە ئەنجامی باشی هەبوو، ئەوەش نەک لە ڕێگای بەڵتەچی و دەستوپێ

شکاندن، ئەم شێوازە چیتر باش کاری خۆی نەکرد، بەڵکو لە ڕێگای هۆشیارانەو کاریگەرانەی پروپاگەندەوە جێبەجێکرا. بیرۆکەکە بریتی بوو لە دۆزینەوەی ڕێگایەک بۆ ئەوەی جەماوەر لە دژی خۆپیشاندەران هانبدرێن. ڕێگایەک بۆ دەرخستنی خۆپیشاندەران وەکو تێکدەر، زیانبەخش بە کۆمەڵگا و دژە بەرژەوەندی گشتی. بەرژەوەندی گشتیش بەرژەوەندی "ئێمەیە" هەموو میللەت، بزنسمانەکان، کرێکارەکان، کابانەکان. ئەمانە "ئێمەین" میللەت هەمووومان بەیەکەوە. ئێمە دەمانەوێ بەیەکەوە بژین و شتەکان وەکو تەبایی و ناسنامەی ئەمەریکاییبوون و پێکەوەکارکردن کۆمان بکاتەوە . لەلایەکی دیش ئەو پیاوخراپانە هەن، خۆپیشاندەران، ئەوانەی تێکدەرن و گیروگرفت دروست دەکەن  و تەبایی و گونجانمان بەیەکەوە  تێکدەشکێنن و ناسنامەی ئەمەریکاییبوون تێکدەدەن. ئێمە پێویستە ئەم خراپەکارانە بوەستێنین بۆئەوەی هەموومان بتوانین بەیەکەوە بژین. بەڕێوەبەری کۆمپانیا و ئەو

کەنناسەی زەویەکان پاک دەکاتەوە هەمووومان هەمان بەرژەوەندیمان هەیە. ئێمە هەمووومان دەتوانین بەیەکەوە کار بکەین و وەک یەکدەست بۆ ناسنامەی ئەمەریکانیزم کاربکەین، یەکترمان خۆشبووێ. ئەمە نامەکە بوو. بۆئەوەی بڵاوبکرێتەوە ئیشی زۆری بۆ کرا. ئیتر لە کۆتایشدا ئەمە کۆمەڵگای بزنسە، ئەوان ڕاگەیاندنەکان کۆنترۆڵ دەکەن و سەرچاوەی زۆریان لەبەردەستە. ئەمەش زۆر بەباشی ئامانجەکانی خۆی پێکا. ئەمە دوایی ناوی لێندرا "هاوکێشەی دۆڵی مۆهاوک"[12] و دەیان جاریتر بۆ دامرکاندنی خۆپیشاندانەکان بەکارهێندرا. ئەم تەکنیکانە پێیان دەگوترا "ڕێگا زانستیەکان بۆ دامرکاندنی خۆپیشاندان" و زۆر کاریگەر بوو، بە جۆشدانی کۆمەڵگا لە پێناو قسەی بێمانا و بیروباوەڕی

---

[12] هاوکێشەی دۆلی مۆهاوک: پلانێک بوو بۆ شکاندنی خۆپیشاندانەکان لە ڕێگای تۆقاندنی خۆپیشاندەران و دوبەرەکی خستنە ناو چینی کرێکاران، لە ساڵی 1936 لەلایەن سەرۆکی کۆمپانیای ڕیمینگتۆن ڕاند بۆ دروستکردنی نامێری چاپکار و مەکینە نوفیسیەکان نووسرا. ئەمە نەکرا بە یاسا، بەڵام لە ڕۆژنامەی ڕێکخراوی نیشتیمانی بەرهەمهێنەران بڵاوکرایەوە و پلانەکە هاتە بەکار هێنانیش.

پڕوپوچ و بەتاڵی وەکو ناسنامەی ئەمەریکاییبوون (ئەمەریکانیزم) بەباشی ئامانجەکانی دەپێکا . کێ دەتوانێ دژی ئەوە بێ؟ یان دژی تەبایی بێ. کێ دەتوانێ دژی ئەوە بێ؟ یان وەکو ئەوەی لە شەڕی کەنداوی فارسی بانگدەدرا "پاڵپشتی لەشکرەکانمان بکە". کێ دەتوانێ دژی ئەو سلۆگانە بێ؟ یان دژی شریتە زەردەکان[13] بێ. کێ دەتوانێ دژی ئەوە بێ؟ ئەو شتانەی کە بە تەواوی بێواتان.

لەڕاستیدا، ئەگەر یەکێک لێت بپرسێ ئایا تۆ پاڵپشتی خەڵکی ئایاوا دەکەی؟ ئەوە مانای هەیە؟ مانای چیە؟  ئایا تۆ دەتوانی بڵێی بەڵێ، من پاڵپشتیان دەکەم، یان نەخێر نایکەم. لەڕاستیدا ئەمە هەر پرسیار نیە. هیچ مانای نیە. ئەمە مەسەلەکەیە. دروشمی هەڵمەتەکانی پەیوەندیە

---

[13] شریتە زەردەکان: پرۆگرامێکی کۆنگرێس و وەزارەی بەرگری ئەمەریکا بوو لە ساڵی 2008  دەستپێکرد بۆ ناسینەوەی ڕۆڵی پاسەوانی نیشتیمانی و سەربازەکان و خێزانەکانیان و پێشکەشکردنی ئاسانکاری بۆ دەستگەیشتنیان بە خزمەتگوزاریەکانی وەکو تەندروستی و پەروەردە. لە کاتی چالاکیەکانیان خۆبەخشان شریتێکی زەردیان بەکار دەهێنا.

گشتیەکانی وەکو "پاڵپشتی لەشکرەکانمان بکە" هیچ مانای نیە. ئەمانە هەر هەمان ئەو مانایە دەبەخشن کە ئایا تۆ پاڵپشتی خەڵکی ئایاوا دەکەی. بەڵام بێگومان شتێکی تری شاراوە هەبووە. شتەکەش ئەوە بووە، ئایا تۆ پاڵپشتی سیاسەتمان دەکەی؟ بەڵام تۆ ناتەوێ خەڵک مێشکی بەلای ئەوەدا بڕوا، ئەمە خاڵی سەرەکی پروپاگەندەی باشە.

تۆ دەتەوێ دروشمێک بەرزبکەیتەوە کە کەس دژی نەوەستێ، بەڵکو هەمووکەس لەدەوریدا کۆببنەوە. دروشمەکە کەس نازانێ مانای چیە، چونکە بۆخۆی هیچ مانایەکی نیە. نرخی ڕاستەقینەی ئەم کارە لەوەدایە تەرکیزی تۆ لە سەر ئەو پرسیارەی کە مانای هەیە لادەدەن: ئایا تۆ پاڵپشتی سیاسەتمان دەکەی؟ ئەوە ئەو پرسیارەیە کە ئێوە بۆتان نیە باسی لێوە بکەن. بەمشێوەیە خەڵکت بۆ پەیدا دەبێ گفتوگۆ لەسەر پاڵپشتی لەشەکرەکان بکەن. کەواتە تۆ سەرکەوتنت بەدەسهێنا، "بێگومان من پاڵپشتی

ناکەم". ئەوە وەکو ئەمەریکانیزم و تەباییەکەیە. ئێمە هەمووومان یەکین، دروشمێکی بەتاڵ، ئیتر با بەگەڵ بکەوین، با دڵنیابین لەوەی ئێمە ئەو بەدکارانەمان لەناو نیە تا بە قسەکانیان دەربارەی پێکدادانی چینەکان و مافەکانیان و ئەمجۆرە کارانە تەبایی ئێمە تێکبدەن.

ئەم تەکنیکە زۆر کاریگەرە. تائێستاش کاری پێدەکرێ. بەدڵنیایشەوە بە وورياییی کاری لەسەر دەکرێ. خەڵک لە پیشەسازی پەیوەندیە گشتیەکان بۆ ڕابواردن لەو جێگایە نین. ئەوان ئەرکێکیان هەیە و ئەنجامی دەدەن. ئەوان هەوڵ دەدەن بەها ڕاستەکان بڕوێنن. لە ڕاستیدا، ئەوان تێڕوانینی خۆیان هەیە کە دیموکراسی دەبێ چۆن بێ: پێویستە سیستەمێک بێ کە چینی پسپۆر ڕاهێنانیان پێبکرێ بۆ ئەوەی لە خزمەتی گەورەکان بن، گەورەکان ئەوانەی کە کۆمەڵگا موڵکی ئەوانە. ئەوەی دەمێنیتەوە لە دانیشتوانەکە پێویستە لە هەموو شێوەیەکی

خۆڕێکخستن دابـبڕێندرێن، چونکە خۆڕێکخستن تەنها گیروگرفت لەگەڵ خۆی دێنێ. ئەوان پێویستە بە تەنیایی لەبەردەم تەلەفزیۆن دابنیشن و ئەو مەسجەیان لە مێشکدا چەقێندرابێ کە دەڵێ: تاکە بەها لە ژیاندا ئەوەیە کە کەلوپەلی زۆرترت هەبێ یان وەکو ئەو خێزانانەی چینی ناوەندی حاڵباش بژی کە سەیریان دەکەی و بەهای جوانی وەکو تەبایی و ئەمەریکانیزمت هەبێ. ئیتر ژیان هەر ئەوەیە. لەوانەیە خۆت لە مێشکی خۆت بیر بکەیەوە کە ژیان پتری تێدایە، بەڵام چونکە تۆ بە تەنها سەیری کونی تونێڵەکە دەکەی، بیردەکەیتەوەو وا سەیری خۆت دەکەی کە لەوانەیە شێت بووبیت، چونکە ئەوە هەموو ئەوەیە کە لەوێ ڕوودەدات. لەلایەکی دی، چونکە خۆڕێکخستن ڕێگاپێنەدراوە- ئەوە بەشێوەیەکی ڕەها زۆر گرنگە، تۆ هەرگیز ڕێگایەکت نیە پێشانت بدا کە ئایا بەڕاستی تۆ شێتی یان تۆ تەنها بۆخۆت گومانێکە و دروستت کردووە، چونکە شتێکی سروشتیە کە گومان ببەیت.

ئیتر ئەمە وێنە نموونەییەکەیە. هەوڵی زۆر دەدرێ بۆ ئەوەی ئەم نموونەییە بەدەست بهێندرێ. ئاشکرایە کە تێڕوانینێک یان نەرینێک لە پشت ئەمە هەیە، مەبەستیشم تێڕوانینە لە دیموکراسی. مێگەلە سەرلێشێواوەکە گیروگرفتە. ئێمە پێویستە نەهێڵین دەنگیان هەبێ و بەرپێی خۆیان بشێلن. پێویستە دایانبڕێنین. ئەوان پێویستە سەیری یاریەکانی کۆتایی خولی فوتبۆڵ بکەن، تەماشای فلیمی بەزم یان فلیمی شەڕ بکەن. زووزووش گردیان دەکەیەوە بۆ ئەوەی دروشمی بێمانای وەکو "پاڵپشتی لەشکرەکانمان بکەن" کاوێژ بکەن. پێویستە وایان لێبکەی بەردەوام لە ترس و دڵەڕاوکێ دابن، چونکە ئەگەر نەترسن و لەهەر شەیتانێک زەندەقیان نەچێت کە لەدەرەوە یان ناوەوە یان لە هەرجێگایەک بێ لەناویان دەبات، لەوانەیە دەسپێبکەن بیربکەنەوە، کە ئەوەش زۆر ترسناکە، چونکە ئەوان بۆ بیرکردنەوە ئامادەنین. کەواتە زۆر گرنگە پەرتەوازە و لاتەریکیان بکەیت.

ئەمە تێڕوانینێکە لە دیموکراسی. لە ڕاستیدا، ئەگەر بگەڕێیتەوە کۆمەڵگای بزنس و کاردارەکان، کۆتا سەرکەوتنی یاسایی کرێکاران لە ساڵی 1935 بوو، کە یاسای واگنەر بوو. کەشەڕ دەستیپێکرد، یەکێتیە کرێکاریەکان باریان تێکچوو، لەگەڵ ئەوانیش کەلتورێکی دەوڵەمەندی چینی کرێکاریش نەما کە لەگەڵ ئەم یەکێتیانە ئاوێتە ببوون. ئەمە تێکشکا. ئێمە بەرەو کۆمەڵگایەک گەشەمان کرد کە بەئاشکرا بزنس بەڕێوەی دەبا. ئێرە تاکە کۆمەڵگای پیشەسازی وڵاتێکی سەرمایەدارییە کە تەنیا پەیمانێکی کۆمەڵایەتی نۆرماڵیش هەبوونی نیە کە لە کۆمەڵگا هاوشێوەکاندا هەیە. جگە لە باشووری ئەفریکا، وابزانم، ئێرە تاکە کۆمەڵگای پیشەسازیە کە بیمەی تەندروستی نیە. پابەندبوونێکی گشتی بۆ نزمترین ئاستی ستانداری ژیان بۆ ئەو بەشەی دانیشتوان دیار نەکراوە کە ناتوانێ بۆخۆی بەدوای ئەم ڕێساو یاسایانە بکەوێ و شتەکان بۆخۆی دابینبکات. یەکێتی وکۆمەڵەکان لە ڕاستیدا بوونیان

نیە. شێوەکانی تری تۆڕی جەماوەری بوونیان نیە. پارتی سیاسی و ڕێکخراوەکان نین. زۆری ماوە بۆ وێنە نموونەییەکە، هەرهیچ نەبێ لەلایەنی پەیکەریەوە. ڕاگەیاندن لەلایەن کۆمپانیاکان مۆنۆپۆل دەکرێت. ئەوانیش هەمان دیدوبۆچوونیان هەیە. هەردوو پارتەکە دوو باڵی پارتی بزنسین. زۆربەی دانیشتوان گرنگی بە دەنگدان هەر نادەن چونکە بێمانا دیارە. ئەوان لاچەپکراون و بە ڕێکی پەرتەوازەکراون. بەلایکەم ئەوە ئامانجەکە بوو. دەموچاوێکی دیاری پیشەسازی پەیوەندیە گشتیەکان، ئێدوارد بێرنەیز[14] لە کۆمسیۆنی کریل چەکەرەی کردووە، ئەو بەشێک بوو لەو کۆمسیۆنە، وانەکە لەوێ فێربوو و ئەویشی تێپەڕاند و ئەو شتەی بەرەوپێش برد کە ناوی لێنا "ئەندازیاریی کۆدەنگی"، کە بە "کرۆکی دیموکراسی"

---

[14] ئێدوارد بێرنەیز (1891–1995 ز) یەکێکە لە داهێنەرانی زانستی پەیوەندیە گشتیەکان و پروپاگەندە و پیشەسازی کۆدەنگی. کتێبێکی گرنگی دەربارەی ئەندازیاریی کۆدەنگی نووسیوە. لە ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەی لایف مەگەزین بە یەکێک لە 100 کاریگەرترین کەسایەتی ئەمەریکا لە سەدەی بیستەم لە قەڵەمدراوە.

باسی کرد. ئەو خەڵکانەی لەتوانایان دایە کۆدەنگی بەڕێوەببەن ئەوانەن کە سەرچاوە و دەسەڵاتیان لەبەردەستە بۆ ئەوەی ئەو کارە بکەن -کۆمەڵگای کاردارەکان-ئەوەش ئەوەیە کە تۆ بۆ ئەو کاردەکەی.

## لەئەندازەدانی بیروڕا

بۆ ئەوەی جەماوەر پاڵپشتی لە سەرکێشیەکانی دەرەوەی سنوور بکا، زۆر پێویستە هانبدرێ. زۆربەی جار کۆمەڵانی خەڵک ئاشتیخوازن، هەروەک چۆن لە شەڕی جیهانی یەکەم وابوون. خەڵکە عامەکە هیچ هۆکارێک نابینن بۆ ئەوەی خۆ لە سەرکێشی دەرەوەی سنوور، کوشتن و ئازاردان هەڵقورتێنن. بۆیە پێویستە تۆ هانیان بدەی. بۆ هاندانیشیان پێویستە ترس لە دڵیان دروست بکەی. بێرنەیز خۆی دەسکەوتی گرنگی لەم بوارە هەبوو. ئەو، ئەو کەسە بوو لە ساڵی 1954 هەڵمەتی پەیوەندیە گشتیەکانی بۆ کۆمپانیای یونایتد فرووت بەڕێوە برد، لەوکاتەی

ولاَته یەکگرتووەکان بۆ لادانی حکومەتی سەرمایەداری-دیموکراسی گواتیمالا و دامەزراندنی کۆمەڵگایەک لە چەتەی پیاوکوژ هەنگاوی نا، کە تائێستاش بە هەمانشێوە لە ڕێگای ناردنی هاوکاری بەردەوامی ولاَتە یەکگرتووەکان بۆ ڕێگریکردن لە لادانی دیموکراسی بێمانا بەردەوامە. زۆر پێویستە کە بەردەوام لە ڕێگای دەسپێشخەریە ناوخۆییەکان، کە کۆمەلاَنی خەڵک دژیەتی فشار دروستبکەی، چونکە هیچ هۆکارێک نیە بۆ خەڵکە ئاساییەکە تا پاڵپشتی پرۆگرامە ناوخۆییەکان بکا کە زیانی بۆ ئەو هەیە. ئەوەش پروپاگەندەی زۆری گەرەکە. ئێمە لەو دە ساڵەی رابردوودا ئەمجۆرە کارانەمان زۆر دیتن. پرۆگرامەکانی ڕێگان[15] بە هیچ شێوەیەک لایەنگری لە ناو خەڵکدا نەبوو. دەنگدەران لە ساڵی 1984 بە ڕێژەی سێ بۆ دوو "لایەنگری ڕێگان" بوون ، هیوایان وابوو کە سیاسەتەکانی نەکرێن بە یاسا. ئەگەر

---

[15] ڕۆناڵد ڕێگان (1911-2004 ز) سەرۆکی چلەمینی ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو.

پرۆگرامێک بە نموونە وەربگرین، وەکو خۆپڕچەککردن، بڕینی پاڵپشتی لە خەرجیە کۆمەڵایەتیەکان،...هتد، هەر یەک لەوانە زۆر بە فراوانی لەلایەن کۆمەڵانی خەڵک دژایەتی دەکرا. بەڵام پێویستە خەڵک بەرکەنار بکرێ و پەرتەوازە بکرێ و ڕێگایەکی نەبێ خۆی ڕێکبخا یان سۆزی دەرببڕێ یان بزانێ کە خەڵکی تر هەن کە هەمان سۆزیان هەیە، ئەو خەڵکەی کە گوتیان ئەوان خەرجکردنیان لەسەر لایەنە کۆمەڵایەتیەکان لە خەرجکردن لەسەر لایەنە سەربازیەکان پێ باشترە، ئەوانەی لە ڕاپرسیدا ئەم وەڵامەیان دا، هەرووەکو چۆن خەڵک بە فراوانی کردی، وایانزانی کە ئەوان هەرخۆیان بەتەنها بوون ئەو بیرۆکە شێتانەیان بە مێشکدا دەهات. ئەوان ئەوەیان لە هیچ جێگایەکی تر چ جاران نەبیستبوو. کەواتە ئەگەر تۆ وابیربکەیەوە لەڕاپرسیەکاندا ئەوە وەڵامت دەبێ، خۆت وا دێتە پێشچاو کە تۆ نائاسایی. لەوکاتەی کە ڕێگایەک نیە بتگەیەنێت بەوانەی کە هەمان بیرۆکە و

دیدوبۆچوونی تۆیان هەیە یان لایەنگری بیروڕایەکانی تۆن و بەهێزی دەکەن، هەست بە خۆت دەکەی کە کەسێکی بێزراوی، غەوارەیت. بەم شێوەیە بۆخۆت لە سیلەیەک دادەنیشی و گرنگی بەوە نادەیت چی لە چواردەورەت دەگوزەرێ. خۆت بە شتی ترەوە خەریک دەکەی، وەکو خولەکانی فوتبۆل.

هەتا ڕاددەیەک، وێنە نموونەییەکە هاتەدی، بەڵام هەرگیز بە تەواوی نا. هەندێ دەزگا هەن کە تا ئێستا مەحاڵە تێکبدرێن. کڵێساکان، بۆ نموونە تا ئێستاش هەر هەن. بەشێکی زۆری چالاکی نەیار لە وڵاتە یەکگرتووەکان لە کڵێساکانەوە سەرچاوە دەگرن، هۆیەکەش دیارە، چونکە ئەوان هەن. کە تۆ سەردانی وڵاتێکی ئەوروپایی دەکەی و گوتارێکی سیاسی پێشکەش دەکەی، زۆر ڕەنگە لە هۆڵی یەکێتیەک پێشکەشی بکەی. لێرە ئەوە ڕوونادات، چونکە یەکێتیەکان زۆر بە دەگمەن هەن، ئەگەر هەشبن ئەوا ڕێکخراوی سیاسی نین. بەڵام کڵێساکان

هەن، کەواتە تۆ زۆرئاسایی گوتار لە کڵێسا پێشکەش دەکەیت. زۆربەی کاری سۆلیدارێتی ناوەڕاستی ئەمەریکا لە کڵێساکانەوە گەشەی کردووە، چونکە کڵێساکان هەن.

میگەلە سەرلێشێواوەکە بەپێی پێویست ماڵیی ناکرێ، بۆیە ئەمە شەڕێکەو ناپسێتەوە. لە ساڵانی سییەکان، سەرلەنوێ هەستانەوە، بەڵام سەرکوتکرانەوە. لە شەستەکان شەپۆلێکی تری نارەزایی سەریهەڵدا. ئەمجارە ناوێکیشی هەبوو. لەلایەن چینی پسپۆر پێیگوترا "قەیرانی دیموکراسی". دیموکراسی وا هەژمارکرا کە لە شەستەکاندا دەچێتە دۆخی قەیران. قەیرانەکە ئەوەبوو کە بەشێکی زۆری دانیشتوان خۆیان ڕێکخستبوو و کارابوون و هەوڵیان دەدا لە کاری سیاسی بەشداری بکەن. لێرەدا ئێمە دێینەوەسەر دوو تێگەیشتنەکە لە دیموکراسی: بەگوێرەی پێناسەی فەرهەنگی؛ ئەمە بەرەو دیموکراسی چوونە. بەگوێرەی

تێگەیشتنی بەردەستیش ئەمە قەیرانە و پێویستە چارەسەربکرێ. دانیشتوان پێویستە بەرەو خاوبوونەوەیی و دەستەمۆیی و خەمساردی ببردرێتەوە کە ئەمە شایانی ئەوانە. ئێمە پێویستە شتێک بکەین بۆ تێپەڕاندنی قەیرانەکە. کاریش بۆ ئەمە ئەنجامدرا، ئامانجی خۆی نەپێکا. خۆشبەختانە قەیرانی دیموکراسی تا ئێستاش زیندووە و هەیە، هەرچەندە لە گۆڕانکاری سیاسیدا زۆر کاریگەر نیە، بەڵام بە پێچەوانەی بۆچوونی زۆرکەس، لە گۆڕینی دیدوبۆچوونەکان کاریگەرە. لە کۆتایی شەستەکاندا هەوڵی گەورە درا بۆ ئاوەژووکردنەوەو زاڵبوون بەسەر ئەم پەتایەدا. یەکێک لە نیشانەکانی ئەم پەتایە ناوێکی تەکنیکی لێندرا. پێیدەگوترا "نیشانەکانی ڤێتنام". نیشانەکانی ڤێتنام دەستەواژەیەکە لە دەوروبەری حەفتاکان پەیدا بوو، لە ڕاستیدا لەملاوئەولا دەهاتە پێناسەکردن. بیرمەندی ڕێگانی نۆرمان پەدهۆریتز[16]

[16]نۆرمان پەدهۆریتز (1930-) سەرنووسەری گۆڤاری کۆمێنتەری

وای پێناسەکردووە: "هەستێکی نەخۆشیئامێزە دژی بەکارهێنانی هێزی سەربازی". ئەم هەستە نەخۆشیئامێزانەی دژی توندوتیژی، لەلایەن بەشێکی کۆمەڵانی خەڵک هەبوون. خەڵک لەوە تێنەدەگەیشتن کە بۆچی پێویستە ئێمە بچین خەڵک ئازار بدەین وخەڵک بکوژین و بۆمبابارانیان بکەین. زۆر خەتەرە کە دانیشتوان ئەم هەستەیان هەبێ، هەروەک گۆبلز[17] وای لێ تێگەیشتبوو، چونکە لەو حاڵەتەدا سنوورێک بۆ سەرکێشیە دەرەکیەکان دادەندرێ. پێویستە، وەک واشنتۆنپۆست بەشانازیەوە لە کاتی هیستیریای شەڕی کەنداو نووسیبووی، پێویستە خەڵک بە ڕێزگرتنی "بەها سەربازیەکان" ڕابهێندرێن. ئەمەش گرنگە، ئەگەر تۆ

---

ئەمەریکایی بوو تا خانەنشینبوونی لە 1995، ئەم گۆڤارەی لە چەپڕەویەوە هەنگاو بە هەنگاو گۆڕی بۆ ڕاستڕەوی. ئەندامێکی سەرەکی پارێزگارەنوێیەکان بوو، ڕۆڵی گەورەی لە سیاسەتەکانی دەرەوەی کۆمارییەکان هەبووە، بەتایبەتی لە ڤێتنام و لە عێراق.

[17] پاوڵ گۆبلز (1897–1945 ز) وەزیری پروپاگەندەی ڕایخی نازی ئەڵمانی بوو.

بخوازی کۆمەڵگایەکی توندوتیژترت هەبێ کە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی نوخبەی ناوخۆ هێز لە هەر چوار لای جیهان بەکاربێنێ، پێویستیشە ڕێزی پێویست بۆ بەها سەربازیەکان هەبێ و هیچیش بۆ ئەو هەستە نەخۆشیئامێزانەی بەکارهێنانی توندوتیژی نەبێ. ئەمە نیشانەکانی ڤێتنامە. زۆر پێویستە ئەوە چارەسەر بکرێ.

## نوێنەرایەتیکردن وەکو ڕاستی

مێژوو پێویستە بە تەواوی ساختە بکرێ. ئەمە ڕێکارێکی ترە بۆ تێپەڕاندنی ئەو هەستە نەخۆشیئامێزانە، بۆئەوەی کاتێ ئێمە هێرش دەکەینە سەرکەسێک و دەیشکێنین، وا دەربکەوێت کە ئێمە لە ڕاستیدا خۆمان لە دوژمناکاران و دڕندەکان و ئەوانی دی دەپارێزین و بەرگری لەخۆمان دەکەین. لەوەتەی شەڕی ڤێتنامەوە، هەوڵێکی زۆر هەبووە بۆ دووبارە بنیادنانەوەی ئەو مێژووە. خەڵکێکی زۆر

دەستپێکرد لەڕاستی ئەوەی ڕوودەدا تێبگا. لەوانەش، سەربازگەلێک و گەنجێکی زۆر کە تێکەڵ بە بزووتنەوە ئاشتیخوازەکان و ئەوانی تریش بوون. ئەمە خراپ بوو، دووبارە شەنوکەوکردنی ئەو بیروڕا خراپانە و گەڕاندنەوەی هەندێ شێوەی ئەقڵانیەت پێویست بوو، بەشێوەیەکی ڕوونتر، پێویستە هەرچیەک ئێمە دەیکەین پێیبزاندرێ کە سەربڵندیە و ڕاست و دروستە. ئەگەر ئێمە باشووری ڤێتنام بۆردومان بکەین، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ئێمە لە دژی هەندێ کەس،پارێزگاری لە باشووری ڤێتنام دەکەین، دژی ڤێتنامیە باشووریەکان! ئەگەرنا خۆ کەسی دی لەوێ نەبوو. ئەمە ئەوەبوو کە بیرمەندەکانی (ڕاوێژکارەکانی) کەنەدی ناویان لێنابوو "دوژمنایەتی ناوخۆ" لە باشووری ڤێتنام. ئەو دەستەواژەیە لەلایەن ئەدلای ستیڤنسن[18] و

---

[18]ئەدلای ستیڤنسن (1900–1965 ز). سیاسی و پارێزەر و دیپلۆماتکارێکی ئەمەریکایی بوو. لە کۆتایی چلەکان حاکمی سی و یەکەمی ویلایەتی ئیلینۆیز بوو.لە پارتی دیموکراتەکان ڕۆڵی هەبوو لە هێنانەپێشەوەی ملیۆنەها گەنج بۆ ڕیزی سیاسەتکاری. بە

خەڵکی تریش دەهاتە بەکارهێنان. ئەمە پێویست بوو بۆ ئەوەی وایلێبکرێت کە وێنەیەکی فەرمی و ڕوونی هەبێ. ئەمەش زۆرباش کاری کرد. کاتێک تۆ لە دەسەڵاتی تەواوت بەسەر ڕاگەیاندن و سیستەمی پەروەردەو ئەکادیمی دڵنیابیت، بەگوێرەی پەیڕەوی داڕێژراو، ئەوکات دەتوانی ئەوە تێپەڕێنی. لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لە زانکۆی ماساشوتس دەربارەی ئاڕاستەی خەڵک بۆ قەیرانی ئێستای کەنداو (مەبەست ساڵی 1991ز) ئەنجام درا-ئاماژەیەک بۆ ئەوە بەدەرکەوەت. لێکۆڵینەوەکە لەسەر بیروڕا و ئاڕاستەکان لە سەیرکردنی تەلەفزیۆن بوو. یەکێک لە پرسیارەکان دەیپرسی، بەڕای تۆ چەند ڤێتنامی لەشەڕی ڤێتنام کوژراون؟ تێکڕای وەڵامەکان لە پرۆگرامی ئەمەریکان تودەی دەیگوت سەد هەزار کەس. لەکاتێکدا بە فەرمی نزیکەی دوو ملیۆن کەسە. لە ڕاستیشدا لە نێوان سێ تا چوار ملیۆن کەس

---

نووسینەکان و ئاخافتنەکانی ڕۆڵی پشتگیری هەبوو لە هەڵبژاردنی کەنەدی وەک سەرۆکی ئەمەریکا.

بوون. ئەو خەڵکانەی لێکۆڵینەوەکەیان ئەنجام دا
پرسیارێکی گونجاویان هێنا پێشەوە: ئێمە چۆن
دەڕوانینە کەلتوری سیاسی ئەڵمانی ئەگەر، ئەمڕۆ
لە خەڵک بپرسی چەند جوولەکە لە هۆلۆکۆست
مردن، ئەوان بە سێ سەد هەزار کەس خەملاندنی بۆ
دەکەن؟ ئەمە دەربارەی کەلتوری سیاسی
ئەڵمانیەکان چیمان پێ دەڵێ؟ ئەوان ئەو پرسیارەیان
بەکراوەیی هێشتەوە، بەڵام ئێوە دەتوانن
بەدواداچوونی بۆ بکەن و ئەنجامتان دەسکەوێت.
ئەمە چیمان دەربارەی کەلتوری خۆمان پێ دەڵێ؟
شتێکمان هەر پێدەڵێ. پێویستە هەستی نەخۆشیئامێز
دژی بەکارهێنانی هێز و لادانە دیموکراسیەکان
چارەسەر بکەین کە لەم کەیسە تایبەتەدا کاری خۆی
کرد. ئەمە لە هەموو بابەتەکانی تریش ڕاستە.
بابەتێک بۆخۆت هەڵبژێرە کە لە خانەی گرنگیپێدانی
خۆتە: ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، تیرۆری نێودەوڵەتی،
ئەمەریکای ناوەڕاست، هەر بابەتێک بێت –ئەو
وێنەیەی جیهان کە بۆ کۆمەلانی خەڵک دەگوازرێتەوە

تەنها لە دوورەوە پەیوەندی بە ڕاستیەوە هەیە. ڕاستی شتەکان لە ژێر نهۆمی درۆ لەسەر درۆ دەشاردرێنەوە. ئەم ئەنجامانە هەمووی لە گۆشەنیگای نەهێشتنی ئەو خەتەرەی دیموکراسی دروستی دەکات سەرکەوتنی گەورەبوون و لە کەشوهەوای ئازادی بەدەستهاتن، کە ئەمەیان زۆر جێگای گرنگپێدانە. ئەمە دەوڵەتێکی تۆتالیتاری نیە، کە بەهێز ئەم کارانە چارەسەربکا. ئەم دەسکەوتانە لە کەشوهەوای ئازادی بەدەستهاتن. ئەگەر ئێمە بمانەوێ لەکۆمەڵگای خۆمان تێبگەین، پێویستە لەو ڕاستیانە ڕامێنین. ئەوانە ڕاستی گرنگن، گرنگن بۆ ئەوکەسانەی گرنگی بەوە دەدەن کە لە چ جۆرە کۆمەڵگایەک دەژین.

# کەلتوری ناڕەزایی

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، کەلتوری ناڕەزایی هەر بە زیندوویی مایەوە. لە وەتەی شەستەکان باش گەشەی کردووە. لە شەستەکان لە گەشەسەندندا هێواش بوو. تا ساڵانی دوای ئەوەی کە وڵاتە یەککرتووەکان دەستیپێکرد بۆردومانی باشووری ڤێتنام بکا، هیچ ناڕەزایی دەربڕینێک بەرامبەر شەڕی ئیندۆچاینی[19] نەبوو. لەوکاتەدا کە دەستی بە گەشەکرد ناڕەزایی بەرتەسک هەبوو، زۆربەیان قوتابی و لاوان بوون. کە گەیشتینە حەفتاکان بەشێوەیەکی بەرچاو گۆڕا. بزووتنەوە جەماوەریە بنەڕەتیەکان پەیدابوون: بزووتنەوەی ژینگەپارێزی، بزووتنەوەی فیمینیستی، بزووتنەوەی دژەناووکی و هیتریش. لە هەشتاکان هێشتا گەشەیکرد بۆ بزووتنەوە سۆلیداریتیەکان، کە شتێکی نوێ و گرنگن لە مێژووی هەر هیچ نەبێ

[19] ئیندۆچاینی: جاران بە ناوچەی وڵاتانی ڤێتنام و لاوس و کەمبۆدیا لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دەگوترا.

ئەمەریکاییەکان، لەوانەیە لە نارەزایی دەربڕین لە جیهانیشدا. تەڤگەر هەبوون تەنها نارەزایی نەبوون بەڵکو خۆیان بەشداریکەر دەبوون، بەشێوەی کەسی، لەژیانی ئەو خەڵکانەی ئازاریان هەبوو لە هەرشوێنێک بووان. ئەوان زۆر شت لەو چالاکیانە فێربوون و کاریگەری شارستانیانەیان لەسەر کۆمەلانی خەڵکی ئاسایی ئەمەریکا هەبوو. ئەوانە هەموو بەیەکەوە جیاوازیەکی گەورەیان دروستکرد. هەرکەسێک سالانێک لەمجۆرە چالاکیانە بەشدار بووبێ، دەبێ ئەوە بزانێ. من بۆخۆم هەست بەوە دەکەم کە ئەوجۆرە ئاخافتنانەی وا ئەمڕۆ لەبەشە هەرە کۆنەپەرستەکانی نیشتیمان – ناوەڕاستی جۆرجیا و ناوچە دوورەدەستەکانی کینتاکی،.. هتد دەیانکەم–جۆرە ئاخافتنێکن کە ئەو کاتانەشی لەگەڵبێ کە بزووتنەوەکانی ئاشتی لە تۆغیان بوون و بەرامبەر چالاکترین جەماوەری بزووتنەوەی ئاشتیەکان نەمدەتوانی بیانکەم. ئەمڕۆ تۆ دەتوانی لە هەرجێگایەک بتەوێ پێشکەشیان بکەی. خەڵک

لەوانەیە لەگەڵت بن یان لەگەڵت نەبن، بەڵام هەرهیچ نەبێ لەوە تێدەگەن کە تۆ باسی چی دەکەی و جۆرە باکگراوندێکی هاوبەشیش هەیە کە دەتوانی بۆپێشەوە بچیت.

ئەمانە هەموو نیشانەی کاریگەری شارستانیانەیە، لەگەڵ ئەو هەموو پروپاگەندەیە، لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵەی دراو دەدرێ بۆ کۆنترۆڵکردنی مێشکی خەڵک و دروستکردنی کۆدەنگی. لەگەڵ ئەوەشدا، خەڵک بۆ بیرکردنەوە لە شتەکان تواناو ئارەزوو پەیدا دەکەن. گومانپەیداکردن لە دەسەڵات زێدە بوو، ئاڕاستەکان دەربارەی زۆر بابەت گۆڕانیان بەسەرداهات. لەوانەیە بەجۆرێک هێواشە، لەوانەیە ساردوسڕیش بێ، بەڵام دیارە و گرنگە. ئایا بایی ئەوە خێرایە کە جیاوازی بەرچاو دروست بکا لەوەی لە جیهان دەگوزەرێ؟ ئەمە پرسێکی ترە. با نموونەیەکی باو بێنینەوە: بەینی ئاشکرای نێوان ڕەگەزەکان. لە ساڵانی شەستەکان ئاڕاستەی پیاو و ژن تا ڕاددەیەکی

زۆر، لە شتی وەکو "بەها سەربازیەکان" و "هەستی نەخۆشیئامێزی دژی بەکارهێنانی هێز" لەیەکدەچوون. کەس، نە پیاو نە ژن، تا سەرەتای شەستەکان گیرۆدەی ئەو هەستە نەخۆشیئامێزە نەبوو. کاردانەوەکان وەک یەک بوون. هەمووان لەسەر ئەو ڕایە کۆکبوون کە بەکارهێنانی توندوتیژی بۆ دامرکاندنەوەی خەڵک لەوێ کارێکی دروست بوو. بە تێپەڕبوونی کات ئەوە گۆڕا. هەستی نەخۆشیئامێز هەڵکشا، لەهەمانکاتیشدا نێوانەکەش فراوانتر بوو، ئێستا زۆر گەورەیە. بە گوێرەی ڕاپرسیەکان، نزیکەی بیست و پێنج لەسەدە. چی ڕوویدا؟ ئەوەی ڕوویدا ئەوەیە هەندێ شێوەی بزووتنەوەی جەماوەری نیمچە-ڕێکخراوەیی هەیە کە ژنان چوونە ناوی-بزووتنەوەی فیمینیستی. ڕێکخستن کاریگەری خۆی هەیە. ڕێکخستن مانای ئەوە دەگەیەنێ کە تۆ ووریایت لەوەی بەتەنها نیت و خەڵکی تریش هەیە وەک تۆ بیر دەکەنەوە. تۆ دەتوانی دیدوبۆچوونی خۆت بەهێزتر بکەیت و زۆرشت دەربارەی

بیرکردنەوەی خۆت و بیروباوەڕی خۆت فێر ببیت. ئەوانە بزووتنەوەی نافەرمین، وەکو ئەو ڕێکخراوانە نین کە بە فۆرم و ئەندامیەتی کار دەکەن، بەڵکو تەنها خولیایە کە گردبوونەوەو هامشۆی خەڵکی لەگەڵ یەکتر تێدایە. ئەوەش کاریگەری زۆر دیاری هەیە. ئەوەیە ترسی دیموکراسی: ئەگەر ڕێکخراوەکان بتوانن گەشە بکەن، ئەگەر خەڵک چیتر وەکو سیکۆتین بە کورسی میترۆکان وەنەنوسێن، لەوانەیە ئەو هەموو بیروڕا جوانە لە ناو مێشکیاندا سەرهەڵبدات، وەکو هەستی نەخۆشیئامێزی دژی بەکارهێنانی هێزی سەربازی. ئەوەیە دەبێ چارەسەربکرێ، بەڵام چارەسەر ناکرێ.

## نمایشی دوژمنان

لەبری ئەوەی باسی شەڕی ڕابردوو بکەین. لێمگەڕێن با من باسی شەڕی داهاتوو بکەم، چونکە هەندێ جار لەبری ئەوەی تەنها لە کاردانەوەدابیت، لە

ئامادەباشیدابیت سوودی هەیە. ئێستا لە وڵاتە یەکگرتووەکان پەرەسەندنێکی جیاواز بەڕێوە دەچێت. ئەویش یەکەم وڵات نیە لە جیهان کە ئەمەی کردبێ. گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ناوخۆ لە زۆربووندایە، لە ڕاستیدا، کارەساتن. کەسێک لە دەسەڵاتداران نیە کە نیەتی هەبێ شتێک بۆ ئەوە بکا. ئەگەر سەیری پرۆگرامە ناوخۆییەکانی حکومەتەکانی دە ساڵی ڕابردوو بکەی-بە ئۆپۆزسیۆنی دیموکراتەکانیشەوە- هیچ پێشنیازێکی جددی دەربارەی گیروگرفتە قووڵەکانی تەندروستی، پەروەردەو خوێندن، بێماڵی، بێکاری، تاوان، زۆربوونی ژمارەی تاوانباران، بەندیخانەکان، خراپی باری ژیان لەگەڕەکە لاچەپەکان-هەموو ئەو زنجیرە گیروگرفتانە نیە. هەموو دەربارەی ئەوانە دەزانن، هەمووشیان بەرەو خراپتر دەچن. تەنها لەو دوو ساڵەی کە جۆرج بۆش هاتۆتە سەر دەسەڵات، سێ ملیۆن منداڵی تر کەوتنە ژێر هێڵی هەژاری. قەرزەکان سەردەکەون، ستاندەری پەروەردە و خوێندن

دادەبەزێ، کرێ بۆ زۆربەی دانیشتوان گەڕاوەتەوە ئاستی کۆتاییەکانی ساڵانی پەنجا، کەسیش بۆ ئەوە هیچ ناکا. لە کەشوهەوای وادا پێویستە مێگەلە سەرلێشێواوەکە لاڕێ بکەی، چونکە ئەگەر دەستیان پێکرد هەست بەوە بکەن لەوانەیە ناڕازی بن، چونکە ئەوە ئەوانن باجەکەی دەدەن. لەوبارەدا تەنها سەیرکردنی زنجیرە تەلەفزیۆنیە گاڵتەجاڕیەکان و خولەکانی فوتبۆل بەس نیە، پێویستە ترسی دوژمنانیان بخەینە بەردەم. لە ساڵانی سیەکان، هیتلەر خەڵکی خۆی لە جولەکە و قەرەجەکان دەترساند. پێویستە ئەوان لەناو ببەیت بۆ ئەوەی خۆت بپارێزیت. ئێمەش ڕێگای خۆمان هەیە. لە دە ساڵی ڕابردوودا، هەر یەک-دوو ساڵ جارێک دێوێک خوڵقێندراوە کە پێویست بکا ئێمە لە دژی ئەو خۆمان بپارێزین. هەموو کاتێکیش یەکێک لەو دێوانە ئامادە و بەردەست بوو: ڕوسییەکان. تۆ هەرکات دەتتوانی ڕوسییەکان بێنیەپێشەوە کە پێویست دەکا خۆتیان لێ بپارێزی. بەڵام ئەوان وەکو دوژمن چیتر ئەو

ڕەونەقەی جارانیان نەماوە. ڕۆژبەڕۆژیش بەکارهێنانی ئەوان دژوارتر دەبێ، بۆیە پێویستە هی تر ئامادە بکەیت. لە ڕاستیدا، خەڵک بە ناهەق ڕەخنەیان لە جۆرج بۆش دەگرت، بەوەی ناتوانێ بۆیان ڕوونبکاتەوە کە کێ لە ڕاستیدا ئەوان دەجوڵێنێت. ئەوە زۆر نادادپەروەرانەیە. بەر لە ناوەڕاستی هەشتاکان، لەو کاتەی تۆ لە خەودابوویت، هەرئەوەندە بەسبوو قەوانەکە لێبدەیت: وا ڕوسییەکان هاتن. بەڵام ئەو ئەوەی لەدەستچوو و پێویستە یەکێکی نوێ دروست بکا، هەروەک چۆن دەزگای ڕێگان بۆ پەیوەندیە گشتیەکان لە هەشتاکان کردی. ئیتر ئەوە تیرۆری نێودەوڵەتی، قاچاخچی ماددە هۆشبەرەکان، عارەبە شێتەکان و سەدام حوسێن، هیتلەری نوێ: وا خەریکە دەسبەسەر جیهان دادەگرێت. تۆ ئەوانەت هەموو هەیە و یەک لە دوای یەک بیانهێنە. دانیشتوان دەترسێنی، دەتۆقێنی، وایان لێدەکەی کە لەترسان خۆیان حەشار بدەن. بەمجۆرە تۆ سەرکەوتنێکی

گەورە بەسەر گریناداو، پەنەما یان هەندێ لەشکری جیهانی سێیەم- کە بەر لەوەی هەر چاویان لێ سووربکەیتەوە دەتوانی تەفروتونایان بکەی - بەدەستدێنی، هەر ئەوەش بوو کە ڕوویدا. ئەوەش سروەیەکی خۆشیمان بۆ دەگەڕێنێتەوە. ئێمە لەدواساتەکاندا خۆمان پاراست. ئەوە ڕێکارێکە کە دەتوانی بەهۆیەوە مێگەلە سەرلێشێواوەکە بە دووربگری لەوەی بەئاگا بێتەوە و تێبگا کە لە ڕاستیدا چی لە چواردەورەی ئەو ڕوودەدات، لێیانگەڕێ با پەرتەوازە بن و کۆنترۆڵ کرابن.

زۆر لەوەدەچێ ئامانجی دادێ کوبا بێت. ئەوەش پێویستی بە بەردەوامبوونی شەڕی ئابووری نایاساییە، یان لەوانەیە دیسان باسی شەڕی تیرۆری نێودەوڵەتی نائاسایی بێتەوە گۆڕەپان. گەورەترین هەڵمەتی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی تا

ئێستا ئەوەبوو کە لەژێر ناوی مۆنگووز[20] لەسەردەمی کەنەدی ئەنجام درا. ئنجا پاشان ئەوکردارانەی بەدوای ئەوەدا هاتن دژی کوبا. هیچ شتێک بەوە بەراورد ناکرێ مەگەر شەڕی دژی نیکاراگوا نەبێ، ئەگەر تۆ بەو بڵێی تیرۆریزم. بەڵام دادگای نێودەوڵەتی ئەمەی وەک دوژمنکاری پۆلێنکرد. هێرشی ئایدیۆلۆجی هەردەم ئامادەیە بۆئەوەی ببێتە بابەتی دروستکردنی دێوێکی وەهمی و پاشان هەڵمەتی لەناوبردنی ئەم دێوە. بەڵام تۆ ناتوانی ئەم هەڵمەتە ئەنجام بدەیت ئەگەر ئەو بتوانێ جارێکی تر بەگژتدابچێتەوە. چونکە ئەمە زۆر ترسناکە. بەڵام ئەگەر تۆ دڵنیای کەئەوان لەناو دەبردرێن، لەوانەیە هێرشی بکەینە سەر و لەناوی ببەین و جارێکی دی سروەیەکی تری خۆشیمان بێتەوەبەر.

[20] ئۆپەراسیۆنی مۆنگووز: ئۆپەراسیۆنێکی سی ئای ئەی ئەمەریکایی بوو لەساڵی 1962 بۆ لادانی سەرۆکی کوبا فیدیل کاسترۆ لە دەسەڵات ئەنجامدرا.

# هەڵبژاردنی دیدوبۆچوون

ئەوە بۆ ماوەیەک بەردەوام بوو. لە ئەیاری 1986 بیرەوەریەکانی زیندانیەکی کوبایی، ئەرماندۆ ڤالادێرز[21] بڵاوکرایەوە. بەخێرایی بوو بە باسوخواسی ڕاگەیاندنەکان. لێرە چەند نموونەیەک وەک خۆی دەنووسمەوە. ڕاگەیاندنەکان دانپێدانانەکانی ئەویان وەسفکرد کە "ڕاپۆرتی حاشاهەڵنەگرە لەسەر سیستەمێکی بەرفراوانی ئەشکەنجەو زیندان کە کاسترۆ[22] بۆ سزادان و سڕینەوەی نەیارە سیاسیەکانی" پەیڕەوی دەکا، ئەوە "ڕاپۆرتێکی ویژدانهەژێن و لەیاد نەچووە" ی "زیندانە نامرۆییەکان" ئەشکەنجەدانی نامرۆڤانەیە، [هەروەها] تۆمارێکی توندوتیژی دەوڵەتە [لەژێر] حوکمی یەکێکیتر لە پیاوکوژانی ئەم سەدەیە، کە لە

---

[21] ئەرماندۆ ڤالادێرز (1937 ز). چالاکوانی کوبایی، لە 1960 لەلایەن حکومەتی کاسترۆ گیرا. لە 1982 بە هەوڵی ڕاستەوخۆی فرانسوا میتیران ئازاد کرا و پەنای بردە بەر ئەمەریکا و ڕەگەزنامەی ئەمەریکایی وەرگرت.

[22] فیدل کاسترۆ (1926-2016 ز). سەرۆکی کوبا لە نێوان (1959-2006 ز)

کۆتاییدا بۆمان دەرکەوت، لە ڕێگای ئەم کتێبەوە "جۆرێکی تازەی لە زۆرداری داهێناوە کە ئەشکەنجەدانی بە بەرنامەی کردۆتە میکانیزمێک بۆ کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگا" لە "ئەو دۆزەخەی کە کوبایە" کە {ڤالادێرزی}ی تێدا دەژیا. ئەم نموونانە لە ڕۆژنامەکانی واشنتۆن پۆست و نیۆیۆرک تایمز وەرگیراون کە لە پێداچوونەوەی کتێبەکە نووسیویانە. کاسترۆ وەکو "دیکتاتۆرێکی تاوانبار" وەسفکراوە. تاوانکاریەکانی لەم کتێبە ئاشکرا کراون، لە ئەنجامدا "تەنها بیرمەندە کاڵفام و بێهەستە ڕۆژئاواییەکان بەرگری لەم دیکتاتۆرە دەکەن" بە قسەی واشنتۆن پۆست. ئەمە بخەرە یاد کە ئەمە تەنها ڕاپۆرتی یەک پیاو بوو، با وادابنێین هەمووی ڕاستە. با هیچ پرسیارێک قیت نەکەینەوە کە لەیەک پیاودا ڕوویداوەو دەڵێ ئەشکەنجە دراوە. لە بۆنەیەکی کۆشکی سپی بۆ بەرزڕاگرتنی ڕۆژی مافی مرۆڤ، ئەو پیاوە لەلایەن ڕۆناڵد ڕێگان لەسەر ئازایەتی و بەرگەگرتنی ترسوتۆقاندنی ئەم

دیکتاتۆرە زاڵمە خوێنڕێژە کوباییە بایەخی پێدرا. پاشان کرایە نوێنەری وڵاتە یەکگرتووەکان لە کۆمسیۆنی مافی مرۆڤی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، لەوێ توانی لە بەرگریکردن لە حکومەتەکانی سلڤادۆر و گواتیمالا خزمەتی بەرچاو پێشکەش بکا،لە بری تاوانبارکردنیان بە تاوانی ئەوەندە گەورە کە بەبەراورد بەوانە، ئەوەی بەسەر خۆی هاتبوو هەرهیچ نەبوون. ئەوە ئەو ڕێگایەیە کە شتەکانی پێ لەجێگای خۆی دادەندرێ.

ئەمە ئەیاری 1986 بوو. ئەمە گرنگ بوو و شتێکت دەربارەی دروستکردنی کۆدەنگی بۆ ڕوون دەکاتەوە. لەهەمان مانگدا، ئەندامە ڕزگاربووەکانی گروپی مافی مرۆڤ لە ئێلسالڤادۆر- سەرکردەکان کوژران- گیران و ئەشکەنجەدران، لەناویاندا هێربەرت ئانایا[23]

[23]هێربێرت نانایا (1954-1987 ز). سەرۆکی کۆمسیۆنی مافی مرۆڤی ئێلسالڤادۆر، لە 1986 بەند کرا، لە بەندیخانە توانی راپۆرتی گرنگ لەسەر پێشێلکاریەکانی مافی مرۆڤ لەلایەن حکومەتی ئێلسالڤادۆر بنێرێتەوە دەرەوە. لە 1987 لە پرۆسەیەکی ئالوگۆڕی زیندانیان ئازاد کرا و پاشان لە هەمان ساڵ لە نزیک ماڵەکەی خۆی تیرۆر کرا.

هەبوو، کە سەرکردەی گروپەکە بوو. ئەوان نێردرانە زیندان-زیندانی لائیسپێرانزا (هیوا). بەڵام کە لەزیندانیش بوون بەردەوامیان بە کاری مافی مرۆڤ دەدا. ئەوان پارێزەر بوون، ئەوان بەردەوامبوون لە وەرگرتنی ئیفادە. ئەوان 432 زیندانی بوون لەو زیندانەدا. ئەوان ئیفادەی واژووکراویان لە 430 لەوان وەرگرت کە لەژێر سوێنددا وەسفی ئەو ئەشکەنجەیان دەکرد کە دەرهەقیان کراوە، ئەشکەنجەدانی کارەبایی و تاوانی دی، لەوانە لەیەک کەیسدا، ئەشکەنجەدانەکە لەلایەن مێجەرێکی وڵاتە یەکگرتووەکان بە جلوبەرگی سەربازی بووە کە بەجوانی وەسفی کرابوو. ئەمە شایەدیەکی بێ پێچوپەنا و گشتگیری نائاساییە، ناوازەیە لە خستنەڕووی کە چ لە ژوورەکانی ئەشکەنجەدان دەگوزەرا. ئەو ڕاپۆرتە 160 لاپەڕەییە کە شایەدی واژووکراوی زیندانیەکانە لە زیندان دزەیکردە دەرەوە لەگەڵ شریتێکی ڤیدیۆ کە خەڵک لە زیندانەکەدا پیشاندەدا لەوکاتەی دەربارەی ئەشکەنجەدانیان

شایەدی دەدەن. ئەمە لەلایەن تیمێکی کارپێسپێردراوی نێوان ئایینەکان لە دەڤەری مارین (شارێکی ئەمەریکایە لە کالیفۆرنیا-و) بڵاوکرایەوە. ڕۆژنامە نیشتیمانیەکان و کەناڵە تەلەفزیۆنیەکان رەتیان کردەوە ئەوە ڕوماڵ بکەن. وتارێک لە ڕۆژنامەی ناوخۆیی دەڤەری مارین، سانفرانسیسکۆ ئیگزامینەر، بڵاوکرایەوە، وابزانم هەر ئەوە بڵاوکرایەوەو بەس. کەسی تر بەلای دا نەچوو. ئەمە لەسەردەمێک بوو کە زۆرتر لەو "بیرمەندە کاڵفام و بێهەستە ڕۆژئاواییانە" پیاهەڵدانیان بۆ جۆن دیوارت و ڕۆناڵد ڕێگان واژوو دەکرد. ئانایا نەبووە جێگای نرخپێدان و بایەخ. لە ڕۆژی مافی مرۆڤ داوەت نەکرا، نەشکرا بە هیچ. ئەو لە پرۆسەیەکی ئاڵوگۆڕی زیندانیان ئازاد کرا و دواییش کوژرا، ڕێگای تێدەچێ لەلایەن ئەو هێزە ئاسایشانەی کە لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکان پاڵپشتی دەکران کوژرابێ. زانیاری زۆر کەم دەربارەی ئەوە بڵاوکرایەوە. ڕاگەیاندنەکان هەرگیز نەیانپرسی کە

ئاخۆ دەرخستنی ئەو تاوانانە-لە بری پەردەپۆشکردنیان و بێدەنگکردنیان- لەوانەبوو کە ژیانی ئەویان لەمردن ڕزگار کردبووایە.

ئەمە شتێکت دەربارەی شێوەی کارکردنی سیستەمێکی باش بۆ دروستکردنی کۆدەنگی پێدەڵێ. بە بەراورد لەگەڵ هەڵمالینەکانی هێربەرت ئانایا لە ئێلسالڤادۆر، بیرەوەریەکانی ڤالادێرز دەنکە تۆوێکە لەتەنیشت چیایەک. بەلام تۆ کارێکت هەیە دەبێ بیکەیت. ئەمە بەرەو شەڕی داهاتوومان دەبات. من پێشبینی دەکەم، تا کردەوە سەربازیەکەی داهاتوو دەسپێدەکات، زۆریترمان لەو چیرۆکانە گوێ لێدەبێ.

چەند تێبینیەک دەربارەی ئەمەی دوایی.با بێینە سەر ئەوە. با من لەو لێکۆڵینەوەی زانکۆی ماساشوتس دەسپێبکەم کە پێشتر ئاماژەم پێدا. چونکە چەند دەرەنجامێکی گرنگی تێدایە. لە لێکۆڵینەوەکە خەڵک پرسیاریان لێکرا کە ئایا ئەوان ڕایان وایە کە وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ کۆتاییهێنان بە داگیرکاری

نایاسایی و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ پێویسته به زەبری هێز بەشداری بکات. به ڕێژەی دوو بۆ یەک، خەڵک له وڵاته یەکگرتووەکان لەوباوەڕەبوون که بەڵێ پێویسته ئەوه بکەن. پێویسته هێز بەکاربێنن لەکەیسی داگیرکاری خاک به شێوەیەکی نایاسایی یان پێشێڵکاری مافەکانی مرۆڤ. ئەگەر وڵاته یەکگرتووەکان ئەم ڕایانەی لەبەرچاو بگرتبایه، پێویستبوو ئێلسالڤادۆر و گواتیمالا و ئیندۆنیزیا و دیمەشق و تێلئەڤیف و کێپ تاون و تورکیا و واشنتۆن و زۆر وڵاتی تریش بۆردومان بکەین. ئەوانه هەمووی کەیسی داگیرکاری نایاسایین و دوژمنکاری و پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤن. ئەگەر تۆ ڕاستیەکان دەربارەی ئەو نموونانه بزانیت، باش دەزانی که تاوان و دوژمنکاریەکانی سەدام حوسێن زۆر به ئاشکرا لەم نموونانەیه. بەڵام له هەر هەموان خراپتر نیه. ئەدی بۆچی کەس نەگەیشته ئەو ئەنجامە. هۆیەکه ئەوەیه که کەس نایزانێ. له سیستەمێکی پروپاگەندەی باش کارکردوودا، که من

لیستێک لەم نموونانە ڕیز دەکەم کەس نازانێ من باسی چی دەکەم . ئەگەر ئێوە حەزتانکرد بەدوایاندا بچن، بۆتان ئاشکرا دەبێ کە ئەم نموونانە ڕاستن.

یەکێک لەمانە وەربگرە کە لە کاتی شەڕی کەنداو بەرجەستە بوو. لە شوبات، لە ناوەڕاستی هەڵمەتی بۆردومانکردندا، حکومەتی لوبنان داوای لە ئیسرائیل کرد کە بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان ژمارە 425 جێبەجێ بکات، کە داوا دەکات دەسبەجێ و بەبێ مەرج لە لوبنان بکشێتەوە. مێژووی دەرچوونی ئەم بڕیارە دەگەڕێتەوە بۆ 1978. لەوکاتەوە تا ئێستا دوو بڕیاری تر دەرچوون کە داوا دەکات دەسبەجێ و بێ مەرج ئیسرائیل لە لوبنان بچێتە دەرەوە. کەچی جێبەجێ نەکرا چونکە وڵاتە یەکگرتووەکان بە بەردەوامی پشتی ئەم داگیرکاریە دەگرێ. لە هەمان کات باشووری لوبنان تیرۆر دەکرێ. لەوێ ژووری گەورەی ئەشکەنجەدان هەیە کە شتی ترسناکی تێدا ئەنجام دەدرێ. هەرئەوێ

بەکاریش دەهێندرێ بۆ هێرش کردنە سەر بەشەکانی دیکەی لوبنان. لەوەتەی ساڵی 1978، لوبنان داگیر دەکرێ، شاری بێروت بۆردومان دەکرێ، نزیکەی 20,000 کەس کوژراون، 80% یان خەڵکی سڤیل بوون. خەستەخانەکان تێکدەدرێن، ڕەشەکوژی، ڕاوڕووت و دزی و جەردەیی زۆر ئەنجام دەدرێ. ئەمانە هەمووی ئاساییە، وڵاتە یەکگرتووەکان پشتی دەگرێ. ئەمە یەک کەیسە. ئێوە هیچتان لەڕاگەیاندنەکان دەربارەی ئەوە نەبینی یان هەر گفتوگۆیەکتان نەبیست دەربارەی کە ئایا ئیسرائیل و وڵاتە یەکگرتووەکان پێویستە بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان ژمارە 425 و بڕیارەکانی دوای ئەوە جێبەجێ بکەن. کەس داوای نەکرد تێلەڤیف بۆردومان بکرێت، کەچی بە پێوەری دوو لە سەر سێی دانیشتوان، دەبوایە ئەمەمان بکردبایە. لە کۆتاییدا ئەمە داگیرکارییەکی نایاسایی و پێشێلکردنێکی خراپی مافەکانی مرۆڤە. ئەمە تەنها یەک کەیسە. کەیسی زۆر خراپتریش هەیە.

داگیرکاری ئیندۆنیزیا بۆ تەیموری ڕۆژهەڵات کە نزیکەی 200,000 کەسی تێدا کوژراوە. ئەمانە هەمووی لەلای ئەو شتی لاوەکین . ئەوە لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکان زۆر بە توندی پاڵپشتی دەکرا و ئێستاش بە پاڵپشتی دیپلۆماسی و سەربازی وڵاتە یەکگرتووەکان بەردەوامە. ئێمە دەتوانین لە هێنانەوەی ئەمجۆرە نموونانە هەر بەردەوام بین.

## شەڕی کەنداو

ئەوە پێتدەڵێت چۆن سیستەمێکی پروپاگەندەی باش کارکردوو کاری خۆی دەکات. خەڵک لەو باوەڕەدان کاتێ ئێمە هێز دژی عێراق و کوێت بەکار دێنین ئەوە لەبەر ئەوەیە کە بەڕاستی ئێمە ئەو مەبدەئە جێبەجێ دەکەین کە داگیرکاری نایاسایی و پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ پێویستە بە هێز بەرەنگاری بکرێن. ئەوان ئەوە نابینن کە چ دەقەومێ ئەگەر ئەو پرەنسیپە لەسەر هەڵسوکەوتی وڵاتە یەکگرتووەکان

جێبەجێ بکرابایە. ئەمە سەرکەوتنی پروپاگەندەیە لە شێوە مەزنەکەیدا.

با سەیری کەیسێکی تر بکەین. ئەگەر لە نزیکەوە سەیری ڕوماڵی شەڕ بکەی لەوەتەی ئابی 1990، هەست دەکەی چەند دەنگێکی بزر هەیە. بۆ نموونە، ئۆپۆزسیۆنێکی دیموکراسی عێراقی هەیە، لە ڕاستیدا ئۆپۆزسیۆنێکی زۆر گرنگ و ئازا. ئەوان ، لە تاراوگە کار دەکەن چونکە نەیاندەتوانی لە عێراق بژین. زۆربەیان لە ئەوروپان. ئەوان کادیری بانک، ئەندازیار، تەلارساز و خەڵکی لەوجۆرەن. ئەوان لێزانن، دەنگی خۆیان هەیە و قسە دەکەن. لە شوباتی ڕابردوو (چاپی یەکەمی ئەم کتێبە لە 1991 بڵاوکراوەتەوە-و) لەوکاتەی سەدام حوسێن هێشتا برادەری خۆشەویست و هاوبەشە بازرگانی جۆرج بۆش[24] بوو، ئەوان هاتن بۆ واشنتۆن، بە گوێرەی سەرچاوەکانی ئۆپۆزسیۆنی دیموکراسی عێراقی، بۆ

---

[24]جۆرج هێربێرت والکەر بۆش (1924- ئێستا 94 ساڵە) سەرۆکی چل و یەکەمینی ئەمەریکا لە نێوان ساڵانی (1989-1993 ز).

داوای پاڵپشتیی بۆ داواکاریەکەیان، بۆ عێراقێکی دیموکراسیی پەرلەمانی. کەس گوێی لێنەگرتن، چونکە وڵاتە یەکگرتووەکان ئەم بابەتەی لەلا گرنگ نەبوو. لە تۆمارە گشتیەکان (میریەکان) هیچ کاردانەوەیەک نەبوو.

لەوەتەی مانگی ئابەوە، پشتگوێخستنی ئەوان تۆزێک دژوارتر بوو . لە ئاب لە ناکاو ئێمە لە سەدام حوسێن هەڵگەڕاینەوە پاش ئەوەی ساڵانێکی دوورودرێژ لەلای ئێمە لە ڕیزی پێشەوە بوو. لێرە ئۆپۆزسیۆنێکی دیموکراسی عیراقی هەیە کە دیدوبۆچوونی دەربارەی ئەو شتە هەیە. ئەوان خۆشحاڵ دەبن کە سەدام حوسێنێک ببینن خنکێندراوە، چواردەوەری گیراوە. ئەو براکانی ئەوانی کوشتووە، خوشکەکانی ئەوانی ئەشکەنجەداون و وڵاتبەدەری کردوون. لە هەموو ئەو سەردەمانەی کە ڕۆناڵد ڕێگان و جۆرج بۆش بە خۆشیەوە کاریان لەگەڵ دەکرد ، ئەوان شەڕی زوڵمی

ئەویان دەکرد. ئەی کوا دەنگی ئەوان لە کوێ بوو؟ سەیرێکی ڕاگەیاندنی نیشتیمانی بکە و ببینە چەند شت دەربارەی ئۆپۆزسیۆنی دیموکراسی عێراقی لە نێوان ئاب تا ئاداری 1990 بڵاوکراوەتەوە؟ ناتوانی تاکە ووشەیەکیش بدۆزیتەوە. ئەوە خەتای ئەوە نەبوو کە ئەوان دەمچەفت بن. ئەوان بەیاننامەیان هەیە، پێشنیازی خۆیان هەیە، بانگەوازو داواکاریان هەیە. کە سەیریان دەکەی، ئەوەت بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لە بزووتنەوەی ئاشتیی ئەمەریکایی جیاوازیان نیە. ئەوان دژی سەدام حوسێنن و دژی شەڕیشن بەرامبەر عێراق. ئەوان نایانەوێ وڵاتەکەیان کاول ببێت. ئەوەی ئەوان دەیانەوێ چارەسەرێکی ئاشتیانەیە. ئەوان باش دەیانزانی کە ئەمە دەکرا بێتەدەست. بەڵام ئەوە تێڕوانینە هەڵەکەیە، کەواتە ئەوان لە دەرەوەی بازنەکەن. ئێمە هیچمان دەربارەی ئۆپۆزسیۆنی دیموکراسی عیراقی نەبیست. ئەگەر بشتهەوێ شتێک دەربارەی ئەوان بدۆزیەوە، سەیری ڕۆژنامەی ئەڵمانی یان بەریتانی بکە. ئەوانیش زۆر

دەربارەی ئەوان باس ناکەن، بەڵام ئەوان ئەوەندەی ئێمە کۆنترۆڵ نەکراون و شتێک دەبێژن. ئەمە دەسکەوتی گەورەی پروپاگەندەیە.یەکەم،دەنگی عێراقیە دیموکراتخوازەکان بە تەواوی دوورخرایەوە، دووەمیش کەس هەستی بەوە نەکرد. ئەمەش گرنگە. ئەمە بە ڕاستی دانیشتوانێکی باش تەڵقیندراوی دەویٚ کە هەست بەمە نەکا، کە ئێمە دەنگی ئۆپۆزسیۆنی دیموکراسی عێراقی نابیستین و پرسیاریش ناکەین بۆ؟ بۆئەوەی وەڵامە دروستەکە بدۆزینەوە: چونکە عێراقیە دیموکراتخوازەکان دیدوبۆچوونی خۆیان هەیە، ئەوان لەگەڵ بزووتنەوەی ئاشتی نێودەوڵەتیدان،کەواتە ئەوان لەدەرەوەی بازنەکەن.

با پرسیاری ئەوە وەربگرین کە هۆکاری شەڕەکە چیە؟ هۆ بۆ شەڕەکە ئامادەکران. هۆیەکان ئەمانەن: تاوانباران نابیٚ پاداشت بکرێن و تاوانکاریی پێویستە بەبەکارهێنانی توندوتیژی بلەز لاببردریٚ؛ ئەمە هۆکاری شەڕەکە بوو. لە بنەڕەتدا هیچ هۆیەکی تر

باس نەکرا. ئایا ئەمە دەکرێ هۆی شەڕەکە بێ؟ ئایا ولاتە یەکگرتووەکان بەدوای ئەم مەبدەئانەیە کە تاوانکاران نابێ پاداشت بکرێن و تاوانکاریی پێویستە بە بەکارهێنانی توندوتیژی نەهێڵدرێ؟ من زیرەکی ئێوە ناشکێنمەوە کە هەنگاو بە هەنگاو بە ڕاستیەکان دادەچمەوە، بەلام ڕاستیەکە ئەوەیە کە ئەو دیبەیت و بەیتوبالۆرانە بە دوو خولەک لەلایەن هەرزەکارێکی خوێندەوار ڕەتدەکرێنەوە. بەلام ئەمە هەرگیز ڕەتنەکرایەوە. سەیرێکی ڕاگەیاندنەکان بکە، شرۆڤەکارە سیاسیە لیبرالەکان و ڕەخنەگرەکان و ئەو خەڵکانەی لە کۆنگرێس شایەدیان دا، بزانە کەس پرسیاری ئەوەی وروژاند کە ئایا ولاتە یەکگرتووەکان بۆ ئەم مەبدەئانە خۆی بەخاوەن دەکا؟ ئایا ولاتە یەکگرتووەکان دژی تاوانکاریی خۆی لە پەنەما وەستایەوە و بۆئەوەی ئەم تاوانکاریە لاببا، واشنتۆنی بۆردومان کرد؟ کە داگیرکردنی نامیبیا لەلایەن ئەفریکای باشوور لە 1969بە نایاسایی ناسێندرا، ئایا ولاتە یەکگرتووەکان

گەمارۆی خستە سەر خواردن و دەرمان؟ ئایا شەڕی کرد؟ ئایا کێپ تاونی بۆمباران کرد؟ نەخێر، بەڵکو بیست ساڵ "دیپلۆماسیەتی کڕ"ی جێبەجێکرد. کە لەو بیست ساڵەدا ئەو باشەش نەبوو. بە تەنها لە سەردەمی ڕێگان-بۆش نزیکەی ملیۆن و نیوێک خەڵک لە وڵاتانی دەوروبەری، لەلایەن ئەفریکای باشوور کوژران. ئەوەی لە ئەفریکای باشوور و نامیبیا ڕوویاندەدا هەر باس مەکە. ئەمە بە هیچ جۆرێک ویژدانی ناسکی ئێمەی نەجوڵاند. ئێمە هەر لە "دیپلۆماسیەتی کڕ" ی خۆمان بەردەوام بووین تا بە پاداشتکردنی تاوانکاران کۆتاییمان پێهێنا. ئەوان گەورەترین بەندەری نامیبیایان پێدرا و بە بیانووی ئاسایشیشیان زۆر دەسکەوتی تریشیان دەسکەوت. ئەدی کوا ئەو مەبدەئەمان کە خۆمانی لێ بە خاوەن دەکەین؟ دیسان، ئەمە گەمەی منداڵانە کە باس بکەین ئەوانە هۆکاری چوونە ناو شەڕەکە بووبن، چونکە ئێمە ئەو مەبدەئانە ناپارێزین. بەڵام کەس نەیکرد-ئەمە ئەو شتەیە کە گرنگە. کەس خۆی

تێکنەدا باسی دەرەنجامەکان بکات کە بەدوای داهاتن: هۆیەک نەدرا بۆ چوونە شەڕ. هیچ. سەبەبێک نەدرا بۆ چوونە ناو شەڕ کە لە دوو خولەکدا لەلایەن هەرزەکارێکی خوێندەوار رەتنەکرێتەوە. ئەمە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی سیستەمی تۆتالیتاری. ئەمە دەبێ بمانترسێنێ، چونکە ئێمە لە شمولیەتدا گەیشتوینەتە ئەو ئاستەی کە ڕاپێچی شەڕمان دەکەن بێئەوەی هۆیەک هەبێ پێشکەشی بکەن. ئەوە ڕاستیەکی سەرسوڕهێنەرە.

بەر لە دەسپێکردنی بۆردومانەکان، لە ناوەڕاستی کانوونی دووەم، ڕاپرسیەکی رۆژنامەی واشنتۆن پۆست- ئەی بی سی پەردەی لەسەر هەندێک شتی گرنگ ڕامالّی: پرسیار لە خەڵک کرا: ئەگەر عێراق لە کوێت کشایەوە لە بەرامبەر ئەوە ئەنجومەنی ئاسایش گرنگی بە کێشەی عەرەبی-ئیسرائیلی بدات، ئایا پشتگیری ئەوە دەکەی؟ نزیکەی بە ڕێژەی دوو- بۆ یەک خەڵک پشتگیری ئەوەیان کرد.

جیهانیش هەمووی هەر وا بیریان دەکردەوە بە ئۆپۆزسیۆنی دیموکراسی عێراقیشەوە. هەروەها راپۆرتکراوە که دوو لە سەر سێی دانیشتوانی ئەمەریکا پشتگیری لەمە دەکات. واش مەزەندە دەکرێ کە ئەوانەی پشتگیری ئەوەیان کرد وایان بەبیرداهاتبێ کە ئەوان بە تەنها لە جیهان بەمشێوەیە بیر دەکەنەوە. بە دڵنیاییەوە کەسێک لە رۆژنامەکان نەیگوت ئەمە بیرۆکەیەکی باشە. فەرمانەکان لە واشنتۆنەوە ئەوە بوون ، ئێمە پێوستە دژی "بەیەکەوە گرێدان" بین، واتە دیپلۆماسی، کەواتە هەموو خەڵک بۆ فەرمانەکە وەکو رەوە قاز ریزکران و هەموو خەڵک دژی دیپلۆماسی بوون. هەوڵبدەن شتێک لە رۆژنامەکان بدۆزنەوە- دەتوانی ستوونێکی ئەلێکس کۆبێرن[25] لە رۆژنامەی لۆس ئەنجلۆس تایمز بدۆزیتەوە کە دیبەیتی ئەوەی کرد لەوانەیە ئەوە بیرۆکەیەکی باش

[25] ئەلیکساندەر کۆبێرن (1942-2012 ز): نووسەرو رۆژنامەوانی ئەمەریکایی بە رەچەڵەک ئیرلەندی، لە نووسینەکانیدا چەپ بوو، دژی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا بوو، داوای ریفۆرمی سیاسی دەکرد.

بێ. ئەو خەڵکەی ئەو پرسیارەیان وەڵام دەدایەوە وایان بیردەکردەوە، من بە تەنهام بەڵام ئەوە ئەوەیە کە من بڕوام پێی هەیە. وادابنێ ئەوان پەیان پێدەبرد کە ئەوان بە تەنها نین و خەڵکی تریش هەیە کە وەک ئەوان بیر دەکەنەوە، وەکو ئۆپۆزسیۆنی دیموکراسی عێراقی. وادابنێ کە ئەوان دەیانزانی کە ئەمە تەنها خەملاندن نیە، لە ڕاستیدا عێراق پێشنیازێکی لەم شێوەی خستە ڕوو. ئەمە لەلایەن گەورە بەرپرسانی وڵاتە یەکگرتووەکان تەنها هەشت ڕۆژ زووتر ئاشکرا کرا. لە 2ی کانونی دووەم، ئەم بەرپرسانە پێشنیازێکی عێراقیان ئاشکرا کرد کە بە تەواوی لە کوێت بچێتە دەرەوە بەرامبەر بەوەی ئەنجومەنی ئاسایش کێشەی عەرەب-ئیسرائیل و چەکە کۆکوژەکان باس بکات. وڵاتە یەکگرتووەکان دانوستانی دەربارەی ئەم بابەتە تا بە ماوەیەکی زۆریش بەر لە داگیرکردنی کوێتەوە ڕەتکردەوە. وادابنێ کە خەڵک دەیانزانی کە بەڕاستی ئەم پێشنیارە لەسەر مێزە و بە فراوانی پاڵپشتی دەکرێ

و لە ڕاستیدا جۆرە ئۆفەرێکە کە هەموو کەسێکی ژێر ئەگەر بڕوای بە ئاشتی هەبێ وەریدەگرێ، هەروەک چۆن ئێمە لە کەیسەکانی تردا دەیکەین، لەو کەیسە دەگمەنانەی کە ئێمە دەمانەوێت تاوانکاری لاببەین. وا دابنێ کە ئەمە دەزاندرا، جا بۆخۆت دەتوانی تەخمین بکەی، بەڵام من وایدادەنێم کە دوو لە سەر سێیەکەی دانیشتوان زیاد دەبوو بۆ 98%. ئا ئەلێرە سەرکەوتنی گەورەی پروپاگەندە دەردەکەوێ. لەوانە نیە هیچ کەس لەوانەی کە بەشداری ڕاپرسیەکەیان کرد، هیچ شتێک لەوانە بزانن کە من ئێستا ئاماژەم پێکردن. خەڵک وایاندەزانی کە ئەوان بە تەنهان. کەواتە بۆیە لەتوانادابوو بەبێ ناڕەزایی، لە گەڵ سیاسەتی شەڕ بدۆمینن.

مشتومڕێکی زۆر دەربارەی کە ئەگەر گەمارۆ سوودی هەبێ هەبوو. سەرۆکی سی ئای ئەی (CIA) هات و دەربارەی کە ئەگەر گەمارۆ سوودی هەبێ گفتوگۆیکرد. بەڵام هیچ گفتوگۆیەک دەربارەی

پرسیارە سەرەکیترەکە نەبوو: ئایا گەمارۆ کاری کردووە؟ وەڵامەکە بەڵێ، تا ڕاددەیەک کاری خۆی کرد– لەوانەیە لە کۆتایی ئاب کردبێتی، یان لە کۆتاییەکانی کانوونی یەکەم. زۆر زەحمەت بوو بەدوای هۆکاری تر بگەڕێی بۆ پێشنیازەکەی عێراق بۆ کشانەوە، کە لە کۆتاییدا ڕاست دەرچوون و لە هەندێ باردا لەلایەن لێپسراوە پلەباڵاکانی وڵاتە یەکگرتووەکان ئاشکراکرا، کە بە "جددی" و "شایانی دانوستان" باسیان کرد. ئایا گەمارۆکان کاریان کرد؟ ئایا دەرچەیەک هەبوو؟ ئایا ڕێگایەک بۆ دەربازبوون هەبوو کە لەلایەن دانیشتوان و هەموو جیهان و ئۆپۆزسیۆنی دیموکراسی عێراقی پەسەند بکرابایە؟ ئەم پرسیارانە گفتوگۆیان دەربارە نەکرا، ئەوە بۆ سیستەمێکی پروپاگەندەی کارا زۆر گرنگە کە ئەمانە گفتوگۆ نەکا. ئەمە ڕێگای بە سەرۆکی کۆمیتەی نیشتیمانی کۆمارییەکان دا کە بڵێت ئەگەر یەکێک لە دیموکراتەکان لەسەر حوکم بوایە، کوێت ئەمڕۆ ئازاد نەدەکرا. ئەو دەتوانێ ئەوە بڵێ و کەس

لە دیموکراتەکان نایێ وەڵام بداتەوەو بڵێ ئەگەر من سەرۆک بوومایە نەک ئەمڕۆ بەڵکو شەش مانگ بەر لە ئێستا ئازاد دەکرا چونکە هەلی وا لەبەردەست بوو کە من دەمقۆزتەوەو کوێت ئازاد دەکرا بێئەوەی دەیان هەزار کەس بکوژرێ و بێئەوەی ببێتە هۆی کارەساتی ژینگەیی. هیچ دیموکراتەک ئەمە ناڵێ چونکە هیچ دیموکراتەک ئەم هەڵوێستەی وەرنەگرت. هێنری گۆنزالیس[26] و باربارا بۆکسەر[27] ئەم هەڵوێستەیان وەرگرت.بەڵام ژمارەی ئەو کەسانەی ئەو هەڵوێستەیان وەرگرت ئەوەندە کەم بوون کە بە نەبوو دادەندرێن.لە کاتێکدا کە هیچ سیاسیەکی

---

[26] هێنری گۆنزالیز (1916-2000ز)، سیاسەتکاری ئەمریکایی لە پارتی دیموکرات، نوێنەری تەکساس بوو لە کۆنگرێس لە نێوان ساڵانی 1961-1999.

[27] باربارا بۆکسەر (1940- ئێستا تەمەنی 78ساڵە)، سیاسەتکاری ئەمریکایی لە پارتی دیموکرات، سیناتۆری کالیفۆرنیا بوو لە نێوان ساڵانی1993-2017. پێشتریش ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران بوو لە نێوان ساڵانی 1983-1993.

دیموکرات وا نالّێ، کلایتن پێتێر[28] ئازادە کە لێدوانەکەی بدات.

کە موشەکەکانی سکۆد ئیسرائیلیان پێکا، کەس لە ڕاگەیاندنەکان هەلهەلەی لێنەدا. دیسان ئەمە ڕاستیەکی گرنگە دەربارەی سیستەمێکی باش کارکردووی پروپاگەندە. ئێمە لەوانەیە بپرسین بۆ نا؟ لە کۆتاییشدا گەنگەشەکانی سەدام حوسێن وەک هەنجەتەکانی جۆرج بۆش باش بوون. ئەوانە چی بوون؟ با لوبنان بە نموونە وەربگرین. سەدام حوسێن دەڵێ ناتوانێ بە داگیرکردن ڕازی ببێ. ئەو ناتوانێ لێبگەڕێ ئیسرائیل بەرزاییەکانی جۆلانی سوریا و ڕۆژهەڵاتی ئۆرشەلیم قووت بدا بە پێچەوانەی ڕێکەوتنێکی بە تێکڕای دەنگەکان لە ئەنجومەنی ئاسایش. ئەو ناتوانێ بەم داگیرکاریە ڕازی ببێ. ئیسرائیل لەوەتەی 1978، بە پێچەوانەی

---

[28]کلایتن پیتیر (1930-2017 ز)، سیاسەتکار و وەزیری ئەمەریکایی لە پارتی کۆماری، سەرۆکی کۆمیتەی نیشتیمانی کۆماریەکان لە ئەنجومەنی نوێنەران لە نێوان ساڵانی 1991-1992.

بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاسایش باشووری لوبنانی داگیر کردووە و ڕازینابێ پێیەوە پابەند بێ. لەو ماوەیەدا هێرشی کردە سەر هەموو لوبنان، ئێستاش کەی حەز بکا لوبنان بۆردومان دەکا. ئەو ناتوانێ بەمە ڕازی ببێ. لەوانەیە ڕاپۆرتەکانی ئەمنستی ئینتەرناشنالی (ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی) دەربارەی کوشتارەکانی ئیسرائیل لە کەناری ڕۆژئاوا خوێندبێتەوە، ئەو ناتوانێ بەمە ڕازی ببێ. گەمارۆکان ناتوانن کاربکەن چونکە وڵاتە یەکگرتووەکان مافی ڤیتۆیان دژ بەکاردێنێ. دانوستان کارناکا چونکە وڵاتە یەکگرتووەکان ڕایاندەگرێ، چی مایەوە جگە لە هێز نەبێ؟ ئەو زۆر چاوەڕوانی کرد. سێزدە ساڵ لە کەیسی لوبنان، بیست ساڵ لە حاڵەتی کەناری ڕۆژئاوا، ئێوە ئەم مشتومڕەتان پێشتر بیستووە. تاکە جیاوازی لە نێوان ئەو مشتومڕانەی پێشوو و ئەوەی گوێت لێبوو ئەوەیە کە سەدام حوسێن بە ئاشکرا دەتوانێ بڵێ سزاکان و دانوستانەکان کاری خۆیان ناکەن چونکە وڵاتە

یەکگرتووەکان بەرەنگاریان دەبێتەوە. بەڵام جۆرج بۆش ناتوانێ ئەمە بڵێ چونکە سزاکان تا ڕاددەیەک کاری خۆی کردووە. هەروەها هۆی خۆی هەبووە کە بڕوابکەین دانوستان کاردەکات-تەنها لەوە نەبێ کە بە ئاشکرا ڕەتیکردەوە بەردەوامیان پێبدا، بە ڕوونی گوتی، دانوستان ئێستا ناکرێ. ئایا ئێوە کەستان دیت لە ڕاگەیاندنەکان ئاماژەی بەوە کردبێ؟ نەخێر، ئەمە قسەی بێمانایە. ئەوە دیسان هەر ئەوەیە کە هەرزەکارێکی خوێندەوار بە یەک خولەک هەستی پێدەکا. بەڵام کەس باسی نەکرد، نە تێبینینووسێک نە نووسەرێکی ڕۆژنامەیەک. دیسان ئەمە نیشانەی کەلتورێکی تۆتالیتاری باشدارێژراوە. ئەمە ئەوە دەردەخا کە دروستکردنی کۆدەنگی کاردەکا.

دوا تێبینی دەربارەی ئەمە. دەتوانین زۆر نموونە بێنینەوە، ئێوە دەتوانن بیانهێننەوە. بیرۆکەی ئەوە وەربگرە کە سەدام حوسێن دێوێکە و دەیەوێ جیهان بخاتە بن ڕکێفی خۆی-کە لە وڵاتە یەکگرتووەکان

خەڵک وا دەڵێ، مێشکی خەڵکیان بەوە کونکردووە. ئەو خەریکە هەموو شتێک ببا، دەبێت ئێمە بیوەستێنین. ئەوە چۆن وا بە توانا بوو؟ ئەو وڵاتێکی بچوکی جیهانی سێیەمە کە ژێرخانێکی پیشەسازی نیە. هەشت ساڵ عێراق لەگەڵ ئێران لەشەڕدا بوو، ئێرانی دوای شۆڕش، کە زۆربەی ئەفسەر و هێزە سەربازیەکەی لەدەست دابوو، عێراق تۆزێک پاڵپشتی هەبوو، لەلایەن یەکێتی سۆڤیات، وڵاتە یەکگرتووەکان، ئەوروپا، زۆربەی وڵاتە عەرەبیەکان و وڵاتە عەرەبیە بەرهەمهێنەرەکانی نەوت. ئەو نەیتوانی ئێران ببەزێنێت. کەچی لەناکاو بوو بەو هێزەی کە دەتوانێ هەموو جیهان داگیر بکا، کەس باسی ئەوەی کرد؟ ڕاستیەکەی ئەمەیە، ئەو وڵاتێکی جیهانی سێیەمە بە لەشکرێک لە جوتیاران. ئێستا وا پەردە لە سەر ئەوە لادەدرێ کە بە تەن زانیاری هەڵە دەربارەی شاردنەوەی چەکە کیمیاویەکان هەبوون،.. هتد. بەڵام ئێوە کەستان بینی کە ئاماژە بەوە بکا؟ نا. لە ڕاستیدا کەستان نەبینی ئاماژە بەوە بکا. ئەمە

نموونەییە. تێبینی بکە کە ئەمە تەنها دوای ساڵێک لەوەی هەمان شت دەرهەق بە مانوێڵ نۆریگا[29] ئەنجام درا. مانوێڵ نۆریگا بە بەراورد لەگەڵ سەدام حوسێنی برادەرەکەی جۆرج بۆش یان برادەرەکانی تری جۆرج بۆش لە بەیجین یان جۆرج بۆش هەر بەخۆی، پیاوکوژێکی بچووک بوو. بە بەراورد لەگەڵ ئەوان، مانوێڵ نۆریگا پیاوکوژێکی بچووکە. خراپە بەڵام نەک لەو جۆرە پیاوکوژە جیهانیانەی کە ئێمە حەزمان لێیانە. کەچی کرایە بوونەوەرێک لە جیهان مەزنتر. ئەو ویستی ئێمە تێکبشکێنێ، سەرکردەی قاچاخچییەکانی مادده هۆشبەرەکانە. ئێمە پێویست بوو دەستوبرد بکەین و لێی بچینە ژوورەوە و سەری پان بکەینەوە. چەند سەد یان هەزار کەسێک بکوژین، دەسەڵات بگەڕێنینەوە بۆ کەمینە سپیپێستەکان کە

[29]مانوێل نورێگا (1934-2017ز)، دیکتاتوری پانامایی، لە نێوان ساڵانی 1983-1989 حوکمی پانامای کرد، لەسەرەتادا لەگەڵ سی ئای ئەی پەیوەندی بەهێزی هەبوو، پاشان لە داگیرکردنی پاناما لەلایەن ئەمەریکاوە لە 1989 هاتەگرتن و لە ئەمەریکا زیندانکرا، پاشان ئازاد کرا و نێردرا بۆ فەرەنساو لەوێش زیندان کرا، پاشان گواسترایەوە پاناما و لەوێش زیندان کرا و هەرلەوێش مرد.

8% ی وڵاتەکە پێکدێنن و ئەفسەرە ئەمەریکاییەکان لە هەموو ئاستەکانی سیستەمی سیاسی دامەزرێنین بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی هەموو شتێک بکەن. ئێمە دەبوایە ئەو هەموو شتە بکەین چونکە لە کۆتاییدا، ئێمە پێویست بوو خۆمان بپارێزین ئەگەرنا لەلایەن ئەو دێوە تەفروتونا دەکراین. ساڵێک دوای ئەمە هەمان شت لەلایەن سەدام حوسێنەوە ئەنجام درا. ئایا کەس ئاماژەی بەوە کرد؟ ئایا  کەس باسی ئەوەی کرد کە چی بوو ڕوویدا و چۆن؟ تۆ پێویستە زۆر بە باشی بەدوای ئەمە  بگەڕێیت.

سەیربکە  ئەمە زۆر جیاوازی نیە لەوەی کۆمسیۆنی کرییل کردی کە جەماوەری ئاشتیخوازی هەڵگەڕاندەوە بۆ کەسانێک کە هیستیریا کۆنترۆڵی دەکردن بۆ ئەوەی هەموو شتێکی ئەڵمانی  تێکبشکێنن بۆ ئەوەی خۆیان لە هەنەکان  بپارێزن، ئەوانەی کە دەستوپلی منداڵە بەلجیکیەکانیان دەبڕی. لەوانەیە تەکنیکەکە پێشکەوتووتر بێ، لەگەڵ تەلەفزیۆن و

ئەوپارە زۆرەی تێیدا بەکاردەهێندرێ. بەڵام هەر زۆر وەکو ئەوەی پێشووە.

من لەو بڕوایەدام، بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە سەر تێبینیە بنەڕەتیەکەم، بەڕاستی ئەوە وا ساکار نیە و تەنها زانیاری هەڵە و قەیرانی کەنداو نیە. پرسەکە گەورەترە. ئەوەیە ئایا ئێمە دەمانەوێ لە کۆمەڵگایەکی ئازاد بژین؟ یان ئایا ئێمە دەمانەوێت لە ژێر چ ڕاددەیەک لە فۆرمی تۆتالیتاریای خۆسەپێنەر بژین، کە تێیدا مێگەلە سەرلێشێواوەکە پەراوێز خراوە، ئاڕاستە کراوە، زەندەقی ڕژێندراوە، سلۆگانی نیشتیمانی دەڵێتەوە، لە ژیانی خۆی دڵنیا نیە، سەرسامە بە سەرکردەکەی کە ئەویان پاراست لە فەوتان، لەوکاتەشدا کۆمەڵی خوێندەواران بە فەرمان، قاز-ئاسا ڕیزکراون و ئەو دروشمانە دووبارەدەکەنەوە کە لێیان چاوەڕواندەکرێ بیڵێنەوە، کۆمەڵگاش لە ناوەوە دەڕوخێت. ئێمە لە کۆتاییدا وەکو وڵاتێکی مورتەزەقەی جێبەجێکار

دەمێنینەوە، چاومان دەبڕینە خەڵکانی دی تا پارەمان پێ بدەن بۆ ئەوەی جیهان تەفروتونا بکەین. ئەمانە فرسەتەکانن. ئەو فرسەتەیە کە پێویستە ڕووبەڕووی ببنەوە. وەڵامی ئەو پرسیارانە تا ڕاددەیەکی زۆر لە دەست کەسانی وەکو ئێوەو من دایە.

# ڕۆژنامەنووسێک لە مەریخەوە

## "شەڕی تیرۆر" چۆن ڕوماڵ بکرێ؟

**ئەم دەقە ووتارێکی پوختەکراوی نەعوم چۆمسکی یە کە لە ڕێکخراوی فێر[30] ( دادپەروەری و ووردەکاری لە ڕاپۆرتدا) بەبۆنەی ساڵیادی پازدەمینی، لە هۆڵی تاون، نیویۆرک لە 22 کانونی دووەمی 2012 پێشکەشی کردووە.**

بابەتێک کە بۆ بۆنەیەکی وەکو ئەمە بگونجێ، بە ڕای من، ئاشکرایە دەبێ ئەو پرسیارە بێ کە ئایا ڕاگەیاندنەکان چۆن هەواڵەکانی چەند مانگی ڕابردوویان ڕوماڵ کردووە، بابەتی "شەڕی تیرۆر" وەکو پێی دەگوترێ، بە تایبەتی لە جیهانی ئیسلامیدا. لێرەدا کە دەڵێم ڕاگەیاندن، مەبەستم مانا فراوانەکەیەتی کە گۆڤارەکانی کۆمێنتاری،

---

[30] فێر، ڕێکخراوی دادپەروەری و ووردەکاری لە ڕاپۆرتدا، ڕێکخراوێکی چاودێریکاری ڕاگەیاندنە، لەساڵی 1986 لە شاری نیویۆرک دامەزراوە. خۆی بە "گروپی نیشتیمانی بۆ چاودێری میدیا" دەناسێنێ. چاودێری ناڕاستی و لایەنگیری لە میدیای ئەمەریکایی دەکات. گۆڤاری مانگانەی ئێکسترا دەردەکا کە تایبەتە بە ڕەخنەگریی لە میدیادا.

شرۆڤەکاری، دیدوبۆچوون و کەلتوری ڕۆشنبیری گشتی لەخۆ دەگرێ.

لە ڕاستیدا ئەمە بابەتێکی گرنگە. ئەم بابەتە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و ناوبەناو لە لایەن دەزگای فێر دەخرێتە ڕۆژەڤ، هەرچەندە لە ڕاستیدا بابەتێکی گونجاویش نیە بۆ قسە کردن، چونکە لێکدانەوەی وورد و دوورودرێژی گەرەکە. بۆیە ئەوەی من لێرەدا دەمەوێ بیکەم تێڕوانینێکی جیاوازە و دەپرسم کە ئایا هەواڵەکە چۆن ڕوماڵ بکرێ، لەژێر ڕۆشنایی پرەنسیپە گشتیەکان کە وەکو ڕێنمایی پەسەندن: پرەنسیپەکانی دادپەروەری، ووردی، پەیوەندیداری و ئەوانی دیش. با لە ڕێگای جۆرە تاقیکردنەوەیەکی فیکری سەیری ئەم پرسە بکەین. وا دابنێ کە بوونەوەرێکی زیرەکی مەریخ -دەڵێن بوونەوەرەکانی مەریخ نێرن بۆیە منیش بە نێر ناویان دەبەم (چۆمسکی بۆیە ئەم تێبینیە باسدەکا چونکە لە زمانی ئینگلیزی بۆ بوونەوەرەکەی He لە بری She

بەکاردێنێ، لە زاری کوردی ناوەڕاستدا ئەم جیاوازیە بەدەرناکەوێ-و)- وادابنێن کە ئەم بوونەوەرە گەیشتە سکولی ڕاگەیاندنی هارڤەرد و کۆلۆمبیا و لەوێ هەموو ئەم بەهرانە فێر بوو کە مێشکی بالآیان پێویستە و لە ناخەوەش بڕوای پێکردن. ئایا ئەم بوونەوەرە مەریخیە هەواڵێکی لەمجۆرە چۆن چارەسەر دەکا؟

من لەو بڕوایەدام ئەو بەوە دەسپێدەکات فاکتەکان (هەقیقەتەکان) کە تێبینیان دەکا دەنێرێ بۆ گۆڤارەکەی کە لە سەر مەریخ دەردەچێ . یەکێک لەم فاکتانە ئەوەیە کە شەڕی دژی تیرۆر لە ڕۆژی 11ی سێپتێمبەر ڕانەگەیاندرا، بەڵکو دووبارە ڕاگەیاندرایەوە، هەمان ئەو بالۆرەیە بەکارهێنرایەوە کە بیست ساڵ بەرلەئێستا لەگەڕی یەکەم بەکارهێندرا. ئیدارەی ڕیگان، من دڵنیام کە ئێوەش دەیزانن، هاتە سەر دەسەڵات و ڕایگەیاند کە شەڕی دژی تیرۆر بناغەی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە

یەککگرتووەکان دەبێ، "پەتای تیرۆر"ی، هەروەکو سەرۆک ناوی لێنا، شەرمەزار کرد. چاو لەسەر تیرۆری نێودەوڵەتی بوو کە لەلایەن وڵاتانی لە جیهانی ئیسلامی و لە ئەمەریکای ناوەڕاستدا پاڵپشت دەکرا. تیرۆری نێودەوڵەتی بەو پەتایە وەسف کرا کە "دوژمنە بەدکارەکانی شارستانیەت خۆی" بڵاوی دەکەنەوە، بۆ ئەوەی "لەو سەردەمە نوێیەدا، بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی بەربەریەتی". لە ڕاستیدا من دەقی قسەکانی کەسێکی میانڕەوی دەسەڵات دەگوازمەوە، وەزیری دەرەوە جۆرج شۆلتز[31].

ئەو قسەیەی کە لە ڕێگانم خواست دەربارەی تیرۆر بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ، ئەمەش ساڵی 1985 بوو . ئەو ساڵەی کە "تیرۆری نێودەوڵەتی" لەو ناوچەیەدا لە لایەن سەرنووسەرەکانەوە لە ڕاپرسی ساڵانەی ئەسۆشیەیتیدپرێس بە هەواڵی سەرەکی ساڵ داندرا، ئیتر خاڵی یەکەمی ڕاپۆرتی ئەو

---

[31]جۆرج شۆلتز (1920- ئێستا 98 ساڵە)، ئابووریناس و سیاسەتکاری ئەمەریکایی، وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بوو لە نێوان ساڵانی 1982-1989.

بوونەوەرە مەریخیە ئەوە دەبێ کە ساڵی 2001 بۆ جاری دووەم ئەمە بووە هەواڵی سەرەکی ساڵ و شەڕی دژی تیرۆر هەروەکو جاری پێشوو دووبارە ڕاگەیەندرایەوە.

زێتریش، پەیوەندیەکی سەیر هەیە؛ هەمان کەسەکانی جاران دیسان لە پێشەوەی بەرپرسیاریەتیەکانن. دۆناڵد ڕامسفیلد لە گەڕی دووەم لایەنی سەربازی لە شەڕی دژی تیرۆر بەڕێوە دەبا، لە جاری یەکەمیش نێردراوی تایبەتی ڕێگان بوو بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بۆ گەڕی یەکەمی شەڕی دژی تیرۆر، بە ساڵی لووتکەکەش، ساڵی 1985. ئەو کەسەی کە تازە چەند مانگێکە دەسنیشانکراوە بۆ ئەوەی دیبلۆماسیەتی شەڕ لە نەتەوە یەکگرتووەکان بەڕێوەببا،جۆن نیگرۆپۆنتی[32]، ئەو کەسەیە کە لە گەڕی یەکەم سەرپەرشتیاری ئۆپەراسیۆنە

---

[32]جون نگروپونتی (1939-ئێستا 79 ساڵە)، دیپلۆماتکاری ئەمریکایی لە پارتی کۆماری، باڵیۆز و بەرێوبەری هەواڵگری و جێگری وەزیری دەرەوە بووە. ڕۆڵی هەبووە لە ڤێتنام و هندۆراس.

سەربازیەکانی ولاٌتە یەکگرتووەکانی دەکرد لە هندۆراس، کە لە شەڕی ولاٌتە یەکگرتووەکان دژی تیرۆر لە گەڕی یەکەمدا بنکەی سەرەکی بوو .

## بەکارهێنانی توخمی هێز

لە ساڵی 1985 تیرۆریزم لە ڕۆژهەلاٌتی ناوەڕاست هەواڵی سەرەکی بوو، بەلاٌم لەو ڕۆژگارەدا لە ئەمەریکای ناوەڕاست بە پلەی دووەم دەهات، لە ڕاستیدا شۆلتز وای دانا ئەو پەتایەی لە ئەمەریکای ناوەڕاست هەیە زەنگی ئاگادارکەرەوەی ئەوەیە. گیروگرفتی سەرەکی، ئەو ڕوونیکردەوە، "ئەو شێرپەنجەیەیە کە ئەوەتا ها لێرە، لەو نیوەگۆیەی زەویدایە"، ئێمە دەمانەوێ لەناویببەین و باشتریشە هەر زوو ئەمە بکەین چونکە ئەم شێرپەنجەیە بەئاشکرا ئامانجەکانی "خەباتی من" ی هیتلەر هەلٌگرتووە، ئەوەندەی نەما بوو دەسبەسەر جیهان دابگرێ . لە ڕاستیشدا ترسناک بوو. خەتەرەکە

ئەوەندە قووڵ بوو کە وایکرد لە ڕۆژی یاسا لە ساڵی 1985 ، سەرۆک باری ناکاوی نیشتیمانی ڕابگەیەنێ، چونکە، وەک ئەو گوتی "هەڕەشەی نائاسایی و زێدەبەدەر بۆ ئاسایشی نیشتیمانی و سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە یەککگرتووەکان" ئەم شێرپەنجەیە لەگەڵ خۆی هەڵیگرتووە- ڕۆژی یاسا، 1ی ئەیار، بە ڕێکەوت، ئەو ڕۆژەیە کە لە گشت جیهان وەکو ڕۆژی پاڵپشتی خەباتی کرێکارانی ئەمەریکا یادی دەکرێتەوە، لە وڵاتە یەککگرتووەکان پشووی نەتەوەپەرستەکانە-.

ئەم باری ئیمێرجێنسیە ساڵانە نوێ دەکرایەوە تا لە کۆتاییدا شێرپەنجە بنبڕکرا. وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا ئەمەی ڕوونکردەوە کە خەتەرەکە ئەوەندە گەورە بوو کە تۆ نەتوانی بە ئامرازە نەرمونیانەکان هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەیت، لە ووتارەکەی لە 14 نیسانی 1986 گوتی: "دانوستان مانای خۆبەدەستەوەدانە ئەگەر سێبەری هێز لەسەر مێزی

گفتوگۆ ئامادەنەبێ"، شۆلتز ئەو کەسانەی شەرمەزار کرد کە "بەدوای ڕێگا یاساییە یوتۆپیاییەکان[33] دەگەڕێن، ڕێگای وەکو ناوبژیوانی دەرەکی، نەتەوە یەکگرتووەکان، دادگای نێودەوڵەتی لە کاتێکدا لایەنی هێز لە هاوکێشەکەدا فەرامۆش دەکەن".

وڵاتە یەکگرتووەکان،لە ڕاستیدا، لە ڕێگای هێزە مورتەزەقەکان کە لە هندۆراس بوون،لە ژێر سەرپەرشتی جۆن نیگرۆپۆنتی توخمی هێزی لە هاوکێشەکە بەکار هێنا، لە هەمان کاتیشدا لە ڕێگریکردن لە بەکارهێنانی یاسا یوتۆپیاییەکان لەلایەن دادگای نێودەوڵەتی و وڵاتەکانی ئەمەریکای لاتینی سەرکەوتوو بوو، بێگومان شێرپەنجەکە لە داگیرکردنی جیهان دوورخرایەوە.

ڕاگەیاندن بەمە ڕازی بوو. تاکە پرسیارێک کە سەری هەڵدا، لە ڕاستیدا تەکتیکی بوو . گفتوگۆیەکی

---

[33] یوتوپیا، کتێبێکە لەلایەن توماس مور لە ساڵی 1516 بڵاوکراوەتەوە (بە لاتینی نووسراوە) . باسی شارێکی خەیاڵی دەکا کە هەموو شتێکی تێدا کامڵ بێ.

ئاسایی لە نێوان هەڵۆکان و کۆترەکان هەبوو. هەڵوێستی هەڵۆکان زۆر بە ئاشکرا لە لایەن نووسەرانی گۆڤاری نیو-ڕیپەبلیک (4ی نیسانی 1984) دەربڕدرا. لە ووتارەکانیاندا، ئەوان داوایان دەکرد کە ئێمە لە ناردنی هاوکاریە سەربازیەکان بۆ "فاشیستە لاتینیەکان بەردەوام بین، بێ ئەوەی گوێ بەوە بدرێ کە چەند کەس دەکوژرێن" چونکە "پێشترێتی باڵای ئەمەریکیەکان لە پێش مافەکانی مرۆڤی سلڤادۆریەکانە" یان هی هەر جێگایەکی تر لە ناوچەکە، ئەمە هەڵۆکانن. هەرچی کۆترەکان بوون، لە لایەکی تردا گەنگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ئەم ڕێگایانە کاری خۆیان ناکەن، ئەوان پێشنیازی ڕێگای ئەلتەرناتیڤیان دەکرد بۆ ئەوەی نیکاراگوا، شێرپەنجەکە، بگەڕێندرێتەوە بۆ "مۆدێلی ئەمەریکای ناوەڕاست" و جێبەجێکردنی "ستانداره هەرێمیەکان" بەسەریدا . من لێرە لە ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست دەخوازمەوە ( 14ی ئازاری 1986، 19ی ئازار1986). مۆدێلی ئەمەریکای ناوەڕاست و

ستانداره هەرێمیەکان مۆدێلی دەوڵەتە تیرۆرکارەکانی ئێلسالڤادۆر و گواتیمالا بوو، کە لەو کاتەدا کوشتار و ئەشکەنجەدان و خاپوورکردنیان ئەنجام دەدا، پێویست ناکا من لێرە وەسفیان بکەم. بۆیە ئێمە پێویستە نیکاراگواش بگەڕێنینەوە سەر مۆدێلی ئەمەریکای ناوەڕاست، ئەمە بە گوێرەی ڕای کۆترەکان.

ووتارەکانی دیدوبۆچوون و سەرنووسینەکان لە ڕۆژنامە نیشتیمانیەکان لەسەر ئەم بابەتە بە سەر دوو بەرە دابەشبوون، پەنجا بە پەنجا لە نێوان هەڵۆکان و کۆترەکان. هەندێ لادان هەبوون، بەڵام ئەوان لە ئاستی هەڵەی ئاماریی پتر نەبوون. کەرەستەی چاپکراو هەیە، ئەگەر ئێوە دەتانەوێ چاویان پێدا بخشێننەوە. لە دەڤەرە سەرەکیەکەی دی، کە لەو کاتەدا پەتاکەی تێدا بڵاو دەبۆوە، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست،بەیەکچوونی زۆر لەوە زیاتر هەبوو.

# هەمان شەڕ، ئامانجی جیاواز

بێگومان ئەم بوونەوەرە زیرەکەی مەریخ گرنگیەکی زۆر بەم مێژووە زۆر هاوچەرخە دەدات، لە ڕاستیدا لەگەڵ دانەبڕانێکی زۆر ئاشکرا، لاپەڕە یەکەمەکان لە سەر مەریخ ئەوە ڕاپۆرتدەکەن کە ئەو پرسەی بە شەڕی دژی تیرۆر دەناسرێ، لە لایەن هەمان پیاوەکانی جاران، دژی ئامانجی زۆر وێکچوو، دیسان ڕاگەیەندرایەوە، هەرچەندە باسی ئەوەش دەکا کە هەمان ئامانجی جارانیش نەبوون.

بەرە بەدکارەکەی دژ بە شارستانیەت لە ساڵی 2001، کاتی خۆی لە ساڵی 1980 تێکۆشەری ئازادی بوون و لە لایەن هەمان ئەو هێزە تایبەتیە ڕاهێنانیان پێدەکرا کە ئێستا وا کونبەکون لە ئەشکەوتەکانی ئەفغانستان بە دوایاندا دەگەڕێن،

ئەوان لە گەڕی یەکەمی شەڕی دژی تیرۆر هاوخەبات بوون و زۆر بە چوستی شانبەشانی بەشەکانی دیکە شەڕی تیرۆریان دەکرد.

خۆ ئەوان ئەجێندای توندڕەوی خۆیان نەشاردبۆوە کە پێشتر لە 1980 دەستیان پێکرد، ئەوکاتەی سەرۆکی میسریان کوشت و بەردەوامیشن. هێرشە تیرۆریستیەکانی لە ناو ڕوسیا ئەنجامدران کە بەشێکن لەوە ئەوەندە بەهێز بوون کە بوو بە هۆی هەڵگیرسانی شەڕێکی ڕانەگەیاندراو دژی پاکستان، کاتێک ڕووسەکان لە 1989لە ئەفغانستان چوونە دەرەوە، ئەم هێرشانە وەستان و وڵاتە کۆربووەوەکەیان بۆ لایەنگرانی وڵاتە یەککرتووەکان بە جێهێشت، کە دەمودەست بوون بە کۆمەڵکوژ، ئیغتیسابکار و تێرۆریست، ئەم ڕۆژگارانە بە خراپترین ماوە لە هەموو مێژووی ئەفغانستان دادەنرێ. هەر ئەوانکەسان هاتنەوە و ئێستا لە چواردەوری کابول دەسەڵاتبەدەستن. بە گوێرەی

ژمارەی ئەمڕۆی بەیانیانی ڕۆژنامەی وۆڵستریت جۆرنال(22ی کانونی دووەمی2011)، دوو لەو ئەمیرانەی شەڕ واخەریکن بەرەو هەڵگیرساندنی شەڕێکی گەورە دەچن، با هیوا بخوازین وادەرنەچێ.

ئەمانە و دەرەنجامەکانیان لە سەر کۆمەڵانی خەڵکی سیڤیلیش چ دەگەیەنن، هەمووی هەواڵی مانشێتی ڕاگەیاندنەکانی مەریخ دەبن. خەڵکێکی زۆر کە بێبەشن لە خواردن و پێداویستیە سەرەتاییەکان، هەرچەندە خۆراک بۆ چەند مانگێک هەبوو بەڵام بە هۆی هەلومەرجەکەوە ناتوانرێ دابەش بکرێ، ئەمە دوای چوار مانگ.

ئێمە دەرەنجامەکانی ئەوە نازانین، لە ڕاستیدا تاهەتایە نازاندرێ . چونکە بنەمایەکی فیکری هەیە کە تۆ بە تیشکی لیزەر هەڵسەنگاندن بۆ تاوانەکانی دوژمن دەکەی، بەڵام سەیری ئەوەی خۆت ناکەی- کە ئەمە زۆر گرنگە- بۆیە ئێمە تەنها دەتوانین کە خەملاندنێکی نادیار بۆ ژمارەی ئەو کەسانەی لە

ڤێتنامیەکان و سلڤادۆریەکان و ئەوانی دی کەلەوێ بەجێمان هێشتن بکەین .

## لادان لە هاوشێوەیی ڕەوشتی

هەروەک من دەڵێم، ئەمە دەبێتە سەردێڕەکانی سەر مەریخ. هەروەها پەیامێریکی باشی مەریخ دەیەوێ چەند بیرۆکەیەکی بنەڕەتی ڕوونبکاتەوە. یەکەمی بەر لە هەمووان، ئەو دەیەوێ بزانێ کە تیرۆریزم دەقاودەق چیە؟ پاشان دووەمیان، گونجاوترین کاردانەوە بەرامبەر ئەو چییە؟ باشە، وەڵامی پرسیاری دووەم هەر چیەک بێ، کاردانەوەی گونجاو دەبێ لەگەڵ هەندێ بنەمای ڕەوشتی ڕاست بگونجێ.

مەریخیەکە زوو ئەوە دەدۆزێتەوە کە ئەو ڕاستیانە چین، هەر هیچ نەبێ بە تێگەیشتنی ئەو سەرکردانەی کە شەڕیان دژی تیرۆر ڕاگەیاند، چونکە ئەوان یەکسەر پێمان دەڵێن، بە بەردەوامیش بە گوێمان دادەدەنەوە کە ئەوان کریستیانی لە خواترسن،

کەواتە ئەوان ئینجیل بە پیرۆز دەزانن، بێگومان ئەوان پێناسەی "دووڕوو" دەزانن وەک چۆن لە ئینجیل هاتووە، دووڕووەکان ئەو کەسانەن کە "ستاندارەکان بەسەر خەڵکی تر جێبەجێ دەکەن، بەڵام لەسەر خۆیان قبوڵی ناکەن".

جا مەریخیەکە تێدەگا، بۆ ئەوەی هەرهیچ نەبێ بگەیت بە کەمترین بنەمای ڕەوشتی ڕاست ، پێویستە ئێمە بڕوابەوەبێنین، لە ڕاستیدا سووربین لەسەر ئەوەی هەر کارێک بۆ ئێمە ڕاست بێ ، ئەوا بۆ خەڵکی تریش هەر ڕاستە، ئەوەی کە خەڵکانی دی دەیکەن ناڕاست بێ ئەوا کە ئێمەش دەیکەین ناڕاستە. ئەوە سەرەتاکانی بنەمای ڕەوشتی ڕاستە. جا هەر کە مەریخیەکە ئەوە تێگەیشت، ئەو دەتوانێ جانتاکانی بپێچێتەوەو بگەڕێتەوە بۆ مەریخ. چونکە توێژینەوەکەی ئەو لێرە کۆتاییهات، ئەو ناتوانێ یەک ڕستە بدۆزێتەوە، یەک ڕستە لەناو ئەو هەموو ڕوماڵ و شیکردنەوەیەدا، دەربارەی شەڕی دژی تیرۆر

که هەر هیچ نەبێ نزیک ببێتەوە لەو کەمترین بنەمایانە. بۆ ئەوە، قسەکانی من وەرمەگرن، بۆخۆتان هەوڵبدەن بەم تاقیکردنەوەیەدا گوزەربکەن – من نامەوێ لێرە زێدەڕۆیی بکەم– ئێوە لەوانەیە ئێستا لێرە ڕستەیەک بدۆزنەوە، دەرچوونێک لە پەراوێزەکان، هەر چەندە زۆر دەگمەنە.

سەرەڕای ئەوە ، خەڵک ئەو بنەمای ڕەوشتە ڕاستە دەزانن. ئەوە بەوە لێکدەدرێتەوە کە لادانێکی زۆر ترسناکە، کەواتە پێویستە لەمپەری توندی لە بەرامبەر دابندرێ بەر لەوەی نیشانەکانی لەسەر کەس دەربکەوێ، هەر چەندە زۆر دەگمەنیشە. لە ڕاستیدا، تەکنیکێکی ووشەسازی هەیە لە حاڵەتێکدا ئەگەر یەکێک بوێریی پەیدا کرد کە بەشداری ئەو لادانە بکات، بەشداری لادانێک بکا کە "ئێمە پێویستە پابەندبین بەو بنەما ڕەوشتیە ڕاستانە کە ئێمە وای پیشاندەدەین ڕێزیان لێدەگرین". لادەرەکان گوناهبارن بەوەی کە پێیدەگوترێ "ڕێژەیی لە

ئاکاردا" -کە مانای وایە پێشنیازی ئەوەی ئەو پێوەرانەی لەسەر خەڵکی تر جێبەجێی دەکەین لەسەر خۆمانیشی جێبەجێ بکەین، یان "هاوشێوەیی" ئەو دەستەواژەیەی کە وابزانم لە لایەن جین کیرکپاتریک[34] داهێنراوە بۆ وەستاندنی ترسی ئەوەی نەوەک یەکێک بوێریی بەدواداچوون بۆ تاوانەکانی ئێمە بکا، یان ئەوان تاوانی توندوتیژکردنی ئەمەریکا ئەنجام دەدەن، یان ئەوان دژەئەمەریکایین. کە ئەمەیان بیرۆکەیەکی جوانترە. ئەم دەستەواژەیە لە شوێنی تر تەنها لە دەوڵەتە تۆتالیتاریەکان بەکاردێ، بۆ نموونە لە ڕووسیای پێشوو، کە دژەسۆڤیەتیی گەورەترین تاوان بوو. ئەگەر کەسێک بیەوێ کتێبێک لە ئیتالیا بڵاوبکاتەوە، گریمان ناوی لێ بنێ دژەئیتالی، بێنە پێش چاوی خۆت کاردانەوەکان لە شەقامەکانی میلان

[34] جین کیرکپاتریک (1926-2006 ز)، دیپلۆماتکار و سیاسەتکاری ئەمەریکایی، ڕاوێژکاری ڕۆناڵد ریگان بوو، یەکەم ژن بوو پۆستی باڵیۆزی ئەمەریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان وەربگرێ، ڕای وابوو پشتی ڕژێمە دیکتاتۆریەکان بگیردرێ ئەگەر سەرنێشە بۆ ئەمریکا دروست نەکەن.

و ڕۆما چۆن دەبن، یان لە هەر وڵاتێک کە ئازادی و دیموکراسی تێیدا بە هەند وەردەگیردرێ.

## پێناسەیەکی بەکارنەهاتوو

با وادابنێین کە بوونەوەرە مەریخیەکە باکی بە شاڵاوێک لە جنێو و هەڵمەتی ناوزڕاندن نیە، با وادابنێین کە ئەو سوورە لەسەر پابەند بوون بە بنەما ڕەوشتیە هەرە سەرەتاییەکان. هەر وەکو من گوتم، ئەگەر ئەم ئەوە بکا، ئەو تەنها ئەوەی بۆ دەمێنێتەوە کە بەرەوماڵ بێتەوە ، بەڵام وادابنێ ئەو سوورە کە بمێنێتەوە و هەندێ زیاتر تەماشا بکا. چ ڕودەدات؟ بگەڕێینەوە بۆ پرسیارەکە، تیرۆر چیە ؟ پرسیارە گرنگەکە.

هەنگاوگەلێکی گونجاو هەیە کە بۆ وەڵامدانەوەی ئەوە، ڕاپۆرتدەرەکەی مەریخ دەتوانێ لەسەری بڕوا: سەیری ئەو کەسانە بکا کە شەڕی دژی تیرۆریزمیان ڕاگەیاندووە و ببینێ کە تیرۆر لەلای ئەوان چ

دەگەیەنێ؛ ئەمە بەشی خۆی دادپەروەری تێدایە. لە ڕاستیدا پێناسەیەکی فەرمی لە ڕێبەری کۆد و لەشکریی وڵاتە یەکگرتووەکان هەیە، لە جێگای تریش هەیە، بەکورتی پێناسە کراوە. پێناسەکە وەکو خۆی دادەنێمەوە، "تیرۆریزم، بریتیەلە بەکارهێنانی پلان بۆ داڕێژراوی توندوتیژیی یان هەڕەشەکردن بە توندوتیژیی بۆ دەستەبەرکردنی ئامانجەکان کە لە سروشتدا سیاسین،ئاینین یان ئایدۆلۆجین، بە ڕێگای ترس و تۆقاندن و زۆرەملێ". ئەمە ساکار دێتە پێش چاو، بەڵام وەکو خۆم دەیبینم،گونجاوە. کەچی ئێمە بە بەردەوامی دەخوێنینەوە کە پێناسەکردنی تیرۆر قورس و ئاڵۆزە، مەریخیەکە لەوانەیە بپرسێ کە بۆچی ئەمە ڕاستە، وەڵامیش بۆ ئەمە هەیە.

پێناسە فەرمیەکە بەکارناهێندرێت. بەکارناهێندرێت لەبەر دوو هۆی گرنگ. یەکەمیان ئەوە لێکدانەوەیەکی زۆر نزیکە لە سیاسەتی فەرمی

حکومەت، لە ڕاستیدا هەر زۆر نزیکن. کاتێک کە سیاسەتی حکومەتیشە، پێی دەگوترێ تەنگژە یان دژەتیرۆر.

بەهەمان شێوە، ئەوە هەر بە تەنها لە ولاتە یەکگرتووەکان نیە، وەک ئەوەی من ئاگاداربم ئەم کارە جیهانیە. هەر بۆ نموونە ئەگەر بگەڕێینەوە ناوەڕاستی شەستەکان، کۆمپانیای ڕاند، ئاژانسی توێژینەوەی نزیک لە پنتاگۆن، کۆمەڵە ڕێبەرێکی گرنگی هێزە ژاپۆنیەکانی بەرەنگاربوونەوەی یاخیبوونی بلاوکردەوە کە دەربارەی هێرشی ژاپۆنیەکان بوو بۆ سەر مانکوریا و باکوری چین لە سالانی سیەکان. من لەوانە بووم کە حەزم لێیان بوو، من ووتارێکیشم دەربارەی نووسی و بەراوردی ڕێبەرەکەی هێزی بەرەنگاربوونەوەی یاخیبوونی ژاپۆنیەکانم کرد لەگەڵ هێزی ولاتە یەکگرتوەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی یاخیبوون لە باشووری ڤیتنام،

کە زۆر بەیەکدەچن. پێویستە بڵێم ئەم گوتارەم باش پێشوازی لێنەکرا.

هەرچۆنێک بێ ئەمە ڕاستیە و ئەوەندەی من بزانم ڕاستیەکی جیهانیشە، جا ئەمە یەکێک لە هۆیەکانە کە تۆ نەتوانی پێناسە فەرمیەکە بەکار بێنی. هۆیەکەی تر کە ناتوانی بەکاریبێنی ساناترە: ئەوەیە کە بۆ پرسیارەکەی تیرۆریستەکان کێن، وەڵامی ڕاست بەدەستەوە نادات.  کەواتە دەبێ پێناسە فەرمیەکە دەستی لێبەربدرێ و پێویستە تۆ بەدوای پێناسەیەکی پوختتر بگەڕێی کەوەڵامە ڕاستەکان بەدەست بدات، ئەمەش قورسە. بۆیە دەبیستی کە ئەمە بابەتێکی ئەوەندە زەحمەتە  مێشکی گەورە زۆرانبازی لەگەڵ دەکا و شتی لەم بابەتە.

خۆشبەختانە، چارەسەر هەیە. چارەسەرەکە ئەوەیە کە تۆ تیرۆریزم بەوجۆرە پێناسەبکەی لەگەڵ ئەو تیرۆریزمە بگونجێ کە دژی ئێمە پیادەی دەکەن، جا ئێمە هەر چ کەس بین. ئەوەندەی من بزانم ئەمە

گشتیە، لە ڕۆژنامەگەریدا، لە ئەکادیمیادا، هەروەها من لەو بڕوایەدام کە ئەمە مێژوویی جیهانییە؛ بەلایکەم، من هیچ وڵاتێکم نەدۆزیەوە کە ئەمە پیادە نەکا. کەواتە، خۆشبەختانە ڕێگایەک هەیە بۆ دەرچوون لە گیروگرفتەکە. ئیتر بەم وەسفە بەسوودەی تێرۆریزم، ئێمە دەتوانین دەرەنجامی پێوانەیی دابڕێژین کە ڕۆژانە دەیانخوێنیتەوە: ئەوەش ئەوەیە کە ئێمە و لایەنگرانمان قوربانی سەرەکی تیرۆریزمین، ئەو تیرۆریزمەش چەکی لاوازانە.

بەڵام لە لایەنە فەرمیەکەیەوە، تیرۆریزم چەکی بەهێزانە، وەکو هەر چەکێکی تر، کەچی بە پێناسە چەکی لاوازانە، لەودەمەی تۆ قەناعەتت هات کە "تێرۆریزم" مانای ئەو تیرۆریزمەیە کە دژی ئێمە ئەنجامدەدرێ . ئەوکات بێگومان دەبێت بە ڕاستی، وەکو پێناسەکە، تیرۆریزم چەکی لاوازانە. ئەو خەڵکەی هەمووکات لەسەری دەنووسن، تۆ لە

ڕۆژنامەکان یان گۆڤارەکان ئەوە دەبینی. ئەوان ڕاستن؛ ئیتر ئەوە دووبارەکردنەوەی بێمانا و نەریتە.

## تیرۆریزمی کتێبی

وادابنێ بوونەوەرە مەریخییەکە بەردەوام دەبێ لە بەرەنگاریی ئەوەی لە ڕوخسارەوە نەریتی جیهانییەو هەروەها بنەما ڕەوشتیە ڕاستەکان کە بەگوێی خەڵکی دادەدەن و پێناسەی فەرمی وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ تیرۆریزم پەسەند دەکا. من پێویستە ئەوە بڵێم کە ئەو ئێستا لە دەرەوەی بۆشایی ئاسمانە، بەڵام با بەردەوام بین. ئەگەر ئەو تا ئەو برە بڕوا، کەواتە بە دڵنیاییەوە ڕوونکردنەوەی ڕوون و ئاشکرا هەیە بۆ تیرۆریزم . بۆ نموونە 11ی سێپتێمبەر نموونەیەکی سەرسامکەرە، شۆکە بۆ تاوانی تیرۆرستی. نموونەیەکی ئاشکرای تری وەکو ئەوە، کاردانەوەی فەرمی وڵاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا بوو کە لە

سەر زاری ئەدمیرال سیر میکائیل بۆیس[35]، سەرکردەی تیمی بەرگری بەریتانی ڕاگەیەندرا و لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەی نیۆیۆرک تایمز لە کۆتایی تشرینی یەکەم (28تشرینی یەکەم2001) بڵاوکرایەوە. ئەو خەڵکی ئەفغانستانی ئاگادارکردەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا بەردەوام دەبن لە هێرشکردنە سەریان "تا سەرکردایەتیەکەیان دەگۆڕن".

تێبینی بکە کە بە گوێرەی پێناسەی فەرمی ,ئەمە وەسفێکی نموونەیی کتێبیە بۆ تیرۆریزمی نێودەوڵەتی، من نامەوێ بیخوێنمەوە، بەڵام ئەگەر ئێوە بیری لێدەکەنەوە ئەوە وەسفێکی نموونەییە. دوو هەفتە بەر لەوە، جۆرج بۆش بە ئەفغانیەکانی گوت؛ کە هێرشەکان بەردەوام دەبن تا ئەو کاتەی گومانلێکراوەکان ڕادەست دەکەن.  بە بیرتان بێ کە

[35]ئەدمیرال (عەمیدی دەریاوان) میکائیل بۆیس (1943-ئێستا 75ساڵە)، ئەفسەرێکی بەریتانیە، ئەندامی ئەنجومەنی لۆردەکانی بەریتانیایە، ڕۆڵی لە بەشدارییپیکردنی بەریتانیا لە جەنگی داگیرکردنی عێراق هەبوو.

لابردنی ڕژێمی تاڵیبان لەسەر دەسەڵات بیرۆکەیەک بوو یەکدوو هەفتە دوای بۆمبارانکردنەکان هێنرایە پێشەوە، کە لە بنەڕەتدا بۆ قازانجی هزرمەندەکان بوو، سا دەتوانن لە بارەی ئەوە بنووسن کە شەڕەکە چۆن بەڕێوەدەچێ.

ئەمەش تیرۆریزمی ناو کتێبەکانە. "ئێمە بەردەوام دەبین لە بۆمبارانکردنیان تا ئەو کەسانەمان ڕادەست دەکەن کە دەمانەوێ ڕادەستیان بکەن". ڕژێمی تاڵیبان داوای بەڵگەی کرد، بەڵام ولاتە یەکگرتووەکان زۆر بە بێڕێزی ڕەتیکردەوە کە هەر باسی ئۆفەرەکانی ڕادەستکردنەوە بکرێ، لەکاتێکدا لەوانەبوو مەبەستیان بووایە، یان لەوانەبوو مەبەستیان نەبووایە، ئێمە ئەوە نازانین چونکە ڕەتکرایەوە.

بە دڵنیاییەوە ئەو مەریخییە ئەوانە تۆمار دەکا، ئەگەر تۆزێکیش خۆی ماندووبکا بە هێنانەوەی زۆر نموونەی تریش، هۆیەکان دەدۆزێتەوە. هۆیەکان ئاسانن . دەسەڵاتدارانی جیهان دەیانەوێ زۆر بە

ڕوونی ئەوە پیشانبدەن کە ناچنە ژێر هیچ بارێک. بۆیە ئەوان قبوڵی بیرۆکەیەک ناکەن کە ئەوان پێویستە بەڵگە بخەنەڕوو، ئەوان ڕازینابن کە داواکاری ڕادەسکردنەوەش تەماشا بکەن. لە ڕاستیدا ئەوان دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕەتدەکەنەوە،بە شێوەیەکی بنبڕ ڕەتیدەکەنەوە. وڵاتە یەکگرتووەکان بە ئاسانی دەیتوانی مۆڵەتێکی ڕوون و ئاشکراو بێ خلّت وەربگرێ، نەک بۆ هۆیەک، بەڵکو ئەو دەیتوانی هەروا بە دەستیبێنێ، بەڵام ئەو ئەم بژاردەیەشی ڕەتکردەوە.

ئەمە شتێکمان لە لا دروست دەکا، لە ڕاستیدا، دەستەواژەیەک لە ئەدەبیاتی کاروباری نێودەوڵەتی و دیبلۆماسیدا هەیە، پێی دەگوترێ "دروستکردنی متمانە". دەستەواژەیەکی تر بۆ ئەوەی ڕایبگەیەنێ کە ئێمە وڵاتێکی تیرۆریستین، بۆیە بۆ ئێوە باشترە کە ئەگەر لەبەردەمماندا بوەستن ئاگاداری

دەرەنجامەکانی ببن .ئەوە بێگومان تەنها ئەگەر "تیرۆریزم" بە مانا فەرمیەکەی بەکاربێنین، هەر وەکو لە ڕێبەری کۆدی یاسایی حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکان پێناسەکراوە، ئەوەش لەبەر ئەو هۆیانەی کە باسمکردن پەسەند ناکرێ.

## کەیسی پێدەنگ

با بێینەوە سەر بنەما ڕەوشتیە ڕاستەکان بە گوێرەی دیدی فەرمی، کە کۆدەنگی جیهانیی لەسەرە و بە دادپەروەریی و ڕوونیی هاتۆتە هەژمارکردن، وڵاتە یەکگرتووەکان مافی خۆیەتی شەڕی تیرۆرستان دژی ئەفغانیەکان دەسپێبکات تا ئەو کاتەی ئەوان گومانلێکراوان ڕادەستی وڵاتە یەکگرتووەکان دەکەن، کە ڕەتدەکاتەوە بەڵگە پێشکەش بکا، یان داواکاری ڕادەستکردنەوەیان پێشکەش بکا، یان بەگوێرەی قسەکانی دوایی بۆیس "تا ئەو کاتەی سەرکردایەتیەکەیان دەگۆڕن". هەر کەسێک کە

دووڕووو نەبێ  بە پێناسەی  ئینجیل، یەکسەر ئەوە دەدۆزێتەوە کە هایتی مافی خۆیەتی تیرۆریزمی گەورە دژی وڵاتە یەکگرتووەکان  ئەنجام بدا تا ئەو کاتەی پیاوکوژ ئیمانوێل کۆنستانت[36] ڕادەست دەکا، ئەو کەسەی تۆمەتبارکراوە بە سەرکردایەتیکردنی هێزێکی تیرۆریستی کە لێپرسراوی سەرەکی مردنی چوار تا پێنج هەزار کەس بوو .

لەو کەیسەدا، کەس باسی بەڵگە ناکا. ئەوان بە بەردەوامی داوای ڕادەستکردنەوەیان کردووە، نزیکترین جار لە 3ی ئەیلولی2001 بوو، لەوکاتەی کە باسی ئەوەکرا ئەفغانستان تووشی کردەوەی تیرۆریزمی دەبێ ئەگەر تیرۆریستە گومانلێکراوەکان ڕادەست نەکا. ئیتر، ئەمە تەنها چوار یان پێنج

[36]ئیمانوێل کۆنستانت (1956-ئێستا 62 ساڵە)، سەرکردەیەکی میلیشیایی هایتیە، ئێستا لە نیویۆرک زیندانیە. لە ساڵی 1993 گروپێکی چەکداری بە ناوی فراف پێکهێنا بۆ کوشتنی لایەنگرانی سەرۆکی لەکارلادراوی پێشوو کە بە کودەتای سەربازی لابردرابوو. لە ساڵانی 1992-1994 کاری بۆ سی ئای ئەی کردووە.

هەزار مرۆڤی ڕەشپێست بوون. من مەزەندە دەکەم کە ئەوە بە ژمارەیەکی زۆر هەژمار نەکرێن.

یان ئەوان پێویستە کارێکی تیرۆری گەورە لە ولاتە یەکگرتووەکان ئەنجام بدەن. کە ئەوان بۆمبایان نیە، لەوانەیە تیرۆری بایۆلۆجی یان شتێکی لەو بابەتە، من نازانم، تا ئەو کاتەی ولاتە یەکگرتووەکان سەرکردایەتیەکەی نەگۆڕێ، کە لە ڕاستیدا هەر لە سەدەی بیستەمەوە دژی خەڵکی هایتی لە تاوانی گەورە بەرپرسە.

یان بە دڵنیایی بەگوێرەی بنەما ڕەوشتیە ڕاستەکان، نیکاراگوا مافی خۆیەتی هەمان شت بکا، ئەو سەرکردانە بکاتە ئامانج کە شەڕی تیرۆریان دووبارە ڕاگەیاندەوە، هەر هەمان پیاوەکانی جاران. هێرشە تیرۆرستیەکان دژی نیکاراگوا زۆر لەوەی 11ی سێپتێمبەر دڕندەتر بوون، دەیان هەزار کەس کوژران، ولات خاپوور کرا، کە لەوانەیە بنیادنانەوەی ئەستەم بێ.

دیسان ئەوە نموونەیەکە پێویست بە هەرا نەکا، بۆیە پێویست ناکا ئێمە دەمەتەقێی دەربارە بکەین. ئەوە هەر پێویست بە هێنانوبردن ناکا، دادگای نێودەوڵەتی حوکمی خۆی دا کە وڵاتە یەکگرتووەکانی بە ئەنجامدانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی تۆمەتبار کرد، ئەنجومەنی ئاسایشیش ئەمەی بە بڕیارێک پشتڕاست کردەوە کە داوایکرد هەموو وڵاتان پابەندی یاسا نێودەوڵەتیەکان بن، بەبێ ئەوەی ناوی هیچ وڵاتێک ببات، بەڵام هەموو کەس دەیزانی کە مەبەستی کێیە، وڵاتە یەکگرتووەکان ڤیتۆی بەکار هێنا،بەریتانیاش دەنگی نەدا، یان حوکمەکانی کۆمەڵەی گشتی لە بڕیارەکانی دواتریدا کە هەمان شتی پشتڕاستکردەوە، بڕیارەکە لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکان و یەک دوو وڵاتی کوچکووچە دژایەتی کرا. دادگای نێودەوڵەتی داوای لە وڵاتە یەکگرتووەکان کرد کە کۆتایی بە تاوانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی بهێنێ و قەرەبووی گەورە بژمێرێ. وڵاتە یەکگرتووەکان بە بڕیارێکی هەردوو پارتەکە وەڵامی

دایەوە کە دەسبەجێ هێرشەکان زیادبکەن، من باسی کاردانەوەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنیشم کرد. ئەوانە هەمووان بەردەوامبوون تا شێرپەنجەکە تێکشکێندرا و تا ئێستاش بەردەوامن. لە تشرینی دووەمی 2001، هەڵبژاردنێک لە نیکاراگوا ئەنجام درا، ڕاستتر لە ناوەڕاستی شەڕی تیرۆریزمدا، وڵاتە یەکگرتووەکان بە توندی دەستی تێوەردا. ئەو ئاگاداری نیکاراگوای کردەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکان بە دەرەنجامی خەرەت ڕازینابێ و بیانووەکانیشی لە پێش دانان. وەزارەتی دەرەوە ڕوونیکردەوە کە ئێمە ناتوانین ڕۆڵی نیکاراگوا لە تیرۆریزمی نێودەوڵەتی ساڵانی هەشتاکان لە بیر بکەین کە بەرگری لە هێرشە تیرۆریستە نێودەوڵەتیەکە کرد کە بووە هۆی ئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان لەسەر تیرۆریزمی نێودەوڵەتی لە لایەن بەرزترین دەسەڵاتی نێودەوڵەتیەوە شەرمەزار بکرێ.

لێرە ئەمانە هەمووی تێپەڕین بێ ئەوەی ناوەندە ڤیکریەکان، کە بە ئاسانی و بە ئارەزوو تەرخانکراون بۆ تیرۆریزم و دووڕوویی، ڤزەیان لێوەبێت، بەڵام من وای بۆ دەچم کە لەوانەیە چەند سەردێڕێک لە ڕۆژنامەکانی مەریخ هەبووبن. ئێوە دەتوانن تەماشا بکەن و ببینن کە لێرە چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵکرا. ئێوە لەوانەیە بەڕێکەوت تیۆری پەسەندی خۆتان، تیۆری "شەڕی ڕەوا" تاقیبکەنەوە لەو کەیسەدا کە گفتوگۆ هەڵناگرێ.

## دەستەمۆکردنی زۆرینە

نیکاراگوا، هەندێ بەرگری بەرامبەر تیرۆریزمی نێودەوڵەتی هەبوو کە لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکان بە بیانووی شەڕی دژی تیرۆریزم دژی ئەو جێبەجێ دەکرا. نیکاراگوا لەشکری هەبوو. بەڵام لە وڵاتەکانی تری ئەمەریکای ناوەڕاست، هێزە تیرۆریستیەکان کە لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکان و پاشکۆکانی چەکدار

دەکران و ڕادەهێنران، ئەوان لەشکر بوون. بۆیە جێگای سەرسوڕمان نەبوو کە تاوانە تیرۆرستیەکان زۆر دژوارتر بوون . ئەمە ئەو مۆدێلەی ئەمەریکای ناوەڕاست بوو کە کۆترەکان داوایان دەکرد شێرپەنجەکەی بۆ بگێڕنەوە. بەڵام لەم کەیسەدا لەبەرئەوەی قوربانیەکان دەوڵەتەکە نەبوو، ئەوان نەیاندەتوانی دەنگیان بگەیەننە دادگای نێودەوڵەتی یان ئەنجومەنی ئاسایش بۆ دادپەروەریەک کە لەدواییدا ڕەتدەکرێتەوە و تووڕدەدرێتە گووفەکی مێژوو، تەنها مەگەر لەسەر مەریخ بێ.

کاریگەریەکانی ئەم تیرۆرە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن مایەوە. لێرە لە وڵاتە یەککرتووەکان، نیگەرانیەکی ئاشکرا دەربارەی کاریگەریی فراوانی تاوانە تیرۆریستیەکانی 11ی سێپتێمبەر هەیە. بۆ نموونە ووتارێک لە لاپەڕەی یەکەمی نیویۆرک تایمز هەیە (2 کانونی دووەم 2002) دەربارەی ئەو خەڵکانەی سوود لە تراژیدیای لێقەوماوان وەردەگرن.

بێگومان، هەمان شت دروستە بۆ ئەوانەی قوربانی تاوانی تیرۆرکاریی خراپترن، بەڵام ئەوە تەنها لە مەریخ ڕاپۆرتدەکرێت.

ئێوە، لەوانەیە بەدوای ڕاپۆرتێک بگەڕێن، بۆنموونە هی کۆنفرانسێک کە لە لایەن عیسابیە سلڤادۆریەکان دوو ساڵێک لەمەوبەر ڕێکخرابوو. تاقیکردنەوەی عیسابیەکان لە ژێر تیرۆریزمی نێودەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکان زۆر تاڵە. ڕاپۆرتەکانی کۆنفرانسەکە پەنجەیان خستەسەر کاریگەری بەجێماو لەوەی کە پێی دەگوترێ کەلتوری تیرۆریزم، کە هیواکانی زۆرینە دەستەمۆ دەکا، ئەوان تێگەیشتن کە دەبێ ڕازی بن بە ژێردەستیی دەوڵەتێکی تیرۆرستی دەسەڵاتدار و ئاژانسە ناوخۆییەکانی، یان دیسان بۆ مۆدێلەکەی ئەمەریکای ناوەڕاست بگەڕێندرێنەوە کە لەلایەن کۆترەکان پێشنیاز کرابوو، لەو کاتەی کە تیرۆریزمی نێودەوڵەتی پاڵپشتکراو لەلایەن دەوڵەت

لە هەشتاکان هەڵکشابوو بۆ لووتکە. بێگومان ئەوە لێرە ڕاپۆرت نەکرا، لەوانەیە لە مەریخ بکرێ.

## هاوپەشکارە بەگوڕوتینەکان

لە ڕاستیدا، مەریخیەکە لەوانەیە هەندێک شتیتری لێکچوون لە نێوان گەڕی یەکەم و گەڕی دووەمی شەڕی تیرۆر تێبینی بکا. لە ساڵی 2001، نزیکەی هەموو وڵاتە تیرۆریستەکان کە ئێوە بیری لێدەکەنەوە زۆر بە گوڕوتینەوە هاتنە ناو هاوپەیمانیەتی دژی تیرۆریزم، هۆکارەکانیش شاراوە نین.

ئێمە هەموومان دەزانین بۆ ڕوسەکان وا بە گوڕوتین بوون، ئەوان بۆ چالاکیە تیرۆریستیە بێبەزەییەکانیان لە چیچان، پشتیوانی وڵاتە یەکگرتووەکانیان دەویست.

تورکیا بە شێوەیەکی تایبەت بەگوڕوتین بوو. ئەوان یەکەم وڵات بوون کە ئامادەبوون لەشکر بنێرن، سەرۆک وەزیرانیان ڕوونیکردەوە کە هۆیەکان چین. ئەمە لە پاداشتی سوپاس و پێزانینیان بوو بۆ ئەو ڕاستیەی کە وڵاتە یەکگرتووەکان تاکە وڵات بوو کە ڕازی بوو چەک بدات بە تورکیا- 80%ی چەکەکانیان لە سەردەمی کلینتۆن ڕادەستکرا-بۆ ئەوەی وایانلێبکەن کە توانایان هەبێ یەکێک لە خراپترین تاوانەکانی تیرۆریستی و پاکژادی نەتەوەیی لە نەوەدەکان ئەنجام بدەن. بۆیە ئەوان زۆر منەتباربوون بۆ ئەمە و لە بەرامبەردا ئامادەییان پێشاندا کە لە شەڕی نوێی دژی تیرۆریزم، بە لەشکر بەشداری بکەن، هیچ کاتێک ئەمانە بە تیرۆریزم هەژمار ناکرێ، دیسان، وەکو هەموو جارێک، چونکە ئێمە ئەنجامی دەدەین کەواتە تیرۆریزم نیە. بەم شێوەیە بە لیستەکەدا وەرەخوارەوە. من باسی هەموو ئەوانی تر ناکەم.

بەهەمان شێوە، ئەمە لە گەڕی یەکەمی شەڕی دژی تیرۆر ڕاست بوو. ئەو ڕاگەیاندنەی ئەدمیرال بۆیس کردی، کە پێشتر قسەکانم وەکو خۆی گواستەوە، دووبارە-داڕشتنەوەی ووتارێکی بەناوبانگی کاربەدەستێکی دەوڵەتمەداری ئیسرائیل ئەببا ئیبان[37] بوو لە ساڵی1980. ئەمەیان بە ماوەیەکی کەم دوای گەڕی یەکەمی شەڕی دژی تیرۆریزم بوو کە ئێمە ڕامانگەیاند. ئیبان دەیویست بیانوو بۆ تاوانەکانی ئیسرائیل لە لوبنان بدۆزێتەوە کە ئەو خۆی بە ئازاربەخش ناوزەندی کرد، بەڵام ئەو ئەوەندەشی گوت کە لەجێگای خۆی بوو، چونکە "بۆچوونێک هەبوو کە ئەو جەماوەرەی ئەم کردەوانە کاریتێکردن، بۆ کۆتاییهێنان بە دوژمنایەتیەکان فشار دروست دەکەن"تێبینی بکە کە ئەمە ڕوونکردنەوەیەکی تری

---

[37] ئەببا ئیبان( 1915-2002 ز )، سیاسەتکار و دیپلۆماتکار و ئەکادیمی بواری زمانەکانی عیبری و عەرەبی ئیسرائیلی بوو. لە پۆستەکانی وەزیری دەرەوەو پەروەردە و جێگری سەرۆک وەزیران و باڵیۆزی ئیسرائیل لە ئەمەریکا و لە نەتەوە یەکگرتووەکان و سەرۆکی ئینستیتیوتی وایزمان بۆ زانست کاریکردووە. بڕوای بە گۆڕینەوەی خاک بە ئاشتی هەبوو.

کتێبیانەیە بۆ تیرۆریزمی نێودەوڵەتی لە دیدە فەرمیەکەیەوە.

دوژمنایەتیەکان کە ئەو باسی دەکرد لە سنووری نێوان ئیسرائیل-لوبنان بوو،لە بنەڕەتدا هەر ئیسرائیلی بوون، گەلێک جار بەبێ بەهانە بوو، بەڵام لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکان پاڵپشتی دەکرا، کەواتە ئەوە وەکو هەرجارێک، تیرۆریزم نەبوو و بەشێکیش نیە لە مێژووی تیرۆریزم لەو سەردەمەدا. لەهەمانکاتدا، بە پشتیوانیەکی ڕژدی وڵاتە یەکگرتووەکان، ئیسرائیل لە لوبنان هێرشی ئەنجامدەدا، بۆ ئەوەی بۆ داگیرکردنی بەگوێری پلانی داڕێژراو هەندێ بەهانە بدۆزێتەوە، بۆمباران و تاوانی تریشی ئەنجام دەدا، هەرچۆنێکبوو، ئەوان بەهانەیان دەستنەکەوت، بەڵام هەر داگیریشیانکرد. نزیکەی هەژدە هەزار کەسیان کوشت و نزیکەی بیست ساڵ لە داگیرکردنی باشووری لوبنان بەردەوامبوون، لەگەڵ کۆمەڵێک تاوان، بەڵام هەموو

ئەوانە هیچ تۆمار نەکراون چونکە وڵاتە یەکگرتووەکان بە ڕژدی پشتیوانی دەکرد.

## خەڵاتکردنی تاوانکاریەکان

هەموو ئەوانە لە 1985 هەڵکشان بەرەو لووتکە- دوای هێرشی 1982، ئەو ساڵە ساڵی لووتکەی تاوانەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیل بوون لە باشووری لوبنان، ئەوەی پێیدەگوترا ئۆپەراسیۆنەکانی "مستی ئاسن"، کۆمەڵکوژی و ڕاگواستنی بەربڵاوی ئەو کەسانە بوو کە فەرماندە باڵاکان پێیان دەگوت "گوندیە تیرۆریستیەکان". ئەم کردەوانە لە ژێر سایەی سەرۆک وەزیران شیمعۆن پێریز[38]-یەکێکە لە کاندیدەکانی خەڵاتی خراپترین تاوانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی لە ساڵی لووتکە 1985- بێنەوەیاد، لەوسەردەمەی کە تیرۆریزم سەرهەواڵی گرنگی ئەو ساڵە بوو .

---

[38]شیمعۆن پێریز (1923-2016 ز)، سیاسەتکاری ئیسرائیلی، لە ساڵی 1956 تا 2014 لە پۆستە باڵاکانی دەوڵەتی ئیسرائیل بوو، سەرۆکی وڵات و سەرۆک وەزیران و وەزیری ناوخۆو ئەندامی کنێست بووە. ڕۆڵی لە دەسپێکردنی دانوستانەکانی نێوان ئیسرائیل و فەلەستین زۆر گەورەیە.

پێشبڕکێکاری تریش هەبوون. یەکێک لەوانە لە سەرەتاکانی 1985 تەقینەوەیەک بوو لە بێروت، ترومبێلێکی بۆمبڕێژکراو. ترومبێلە بۆمبڕێژکراوەکە لە بەردەم مزگەوتێک وەستێندرابوو، کاتەکەی وا داندرابووەوە کە هەمووان دێنەدەرەوە بۆ ئەوەی زۆرترین قوربانی لێبکەوێتەوە. ئەوە بووە هۆی کوشتنی هەشتا کەس و بریندارکردنی پتر لە دوو سەد و پەنجا کەس، بە گوێرەی واشنتۆن پۆست کە ڕاپۆرتێکی سامناکی دەربارەی ئەوە بڵاوکردەوە زۆربەی ئەوانە ژن و کچ بوون، بەڵام بۆمبێکی گەورەی بە زەبر بوو زارۆکی لەناو پێخەفەکان کوشت و جۆرەها تاوانی تریش، بەڵام ئەوە هەژمار ناکرێ، چونکە ئەوە لە لایەن سی ئای ئەی و هەواڵگری بەریتانی ڕێکخرا بوو،کەواتە ئەوە تیرۆریزم نیە، بۆیە نابێتە کاندیدی خەڵاتەکە.

ئێستا تاکە پێشبڕکێکارێک کە مابێتەوە لە ساڵی لووتکەکە،ساڵی 1985، بۆمبارانکردنی تونسە لە لایەن ئیسرائیلەوە،کە حەفتاوپێنج کەسی کوشت،

هەندێ ڕاپۆرتی سامدار لە ڕۆژنامەکانی ئیسرائیل لەلایەن ڕاپۆرتنووسانی باشەوە بڵاوکرانەوە. وڵاتە یەکگرتووەکان لەو تاوانە بەشداریکرد بەوەی نەیتوانی بە لایەنگرە تونسیەکانی بڵێ کە بۆمباهاوێژەکان وا لە ڕێگان. جۆرج شۆلتز،وەزیری دەرەوە،ڕاستەوخۆ بانگی ئیسحاق شامیر، سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیلی کرد ، بۆ ئەوەی پێی بڵێ کە وڵاتە یەکگرتووەکان سۆزی زۆری بۆ ئەم کردارە هەیە،وەکو وایگوت. هەرچەندە شۆڵتز لە پاڵپشتیکردنی ئاشکرا بۆ ئەم تیرۆریزمە نێودەوڵەتیە پاشەکشەی کرد کاتێک کە ئەنجومەنی ئاسایش وەکو کارێکی دوژمنکارانەی چەکداریی بە کۆی دەنگ ناساندی، لێرە وڵاتە یەکگرتووەکان دەنگی نەدا.

با بەردەوام بین لەوەی سوودی گومانکردن بدەین بە واشنتۆن و لایەنگرانی، هەروەکو لە کەیسی نیکاراگوا، با وا گریمان بکەین کە تاوانەکە تەنها تیرۆریزمی نێودەوڵەتی بوو، نەک تاوانی دوژمنکاری گەورەتر، وەکو ئەوەی ئەنجومەنی ئاسایش

دانیپێدانا. ئەگەر ئەوە تاوانکاری بووایە، ئەوا بە گوێرەی بنەما ڕەوشتیە ڕاستەکان، جێگامان دادگاکانی نۆرمبێرگ دەبوو.

ئەوانە تەنها سێ کەیس بوون کە لە ساڵی1985 گەیشتنە لوتکە. دوو هەفتەیەک دوای تەقینەوەکەی تونس، سەرۆک وەزیران پێریز هاتە واشنتۆن، لەگەڵ ڕۆناڵد ڕێگان بەشداریکرد لە شەرمەزارکردنی "کارەساتی شەیتانیی تیرۆریزم" لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. هیچ شتێک لەوانە کۆمێنتێکی بە دوای خۆی نەهێنا، ئەمەش ڕاستە چونکە ئیتر بوو بە نەریت کە هیچ یەکێک لەوانە تیرۆریزم نیە. جارێکی تر سەیری نەریتەکە بکەن: تەنها ئەوە تیرۆریزمە ئەگەر ئەوان بەرامبەر ئێمە شتێک ئەنجام بدەن. ئەگەر ئێمە زۆر خراپتریان بەرامبەر بکەین ئەوا تیرۆریزم نیە. دووبارە پرەنسیپە گشتیەکان. مەریخیەکە لەوانەیە درک بەوە بکا، هەر چەندە ئەگەر لێرە قابیلی گفتوگۆش نەبێ.

من سەیرترین کۆمێنتم لە مێژوودا بۆ هات کە زۆر پێمخوشە، کاتێک چەند ساڵێک لەمەوبەر لەسەر ئەم بابەتەم نووسی. ئەو کۆمێنتە بەدواداچوونێک بوو لە واشنتۆن پۆست (18سپتێمبەر1988)، نووسینێک لە دوو ووشە پێکهاتبوو لە لایەن پەیامنێرەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان نووسرا بوو، کە وەسفی کردبوو بە "هەناسەسوارێکی شێواو" من شتێکی لەو بابەتەم. من وای بۆ دەچم ئەو هەڵە بووبێ کە دەڵێ (هەناسەسوار)، ئەگەر ئێوە وتارەکەتان خوێندبێتەوە، زۆر ئارام و هێمنە- بەڵام(شێواو) ڕاستە مەبەستم وایە، ڕاستە پێویستە مرۆڤ بشێوێت بۆ ئەوەی بنەما سەرەتاییەکانی ڕەوشتە ڕاستیەکان قبوڵبکا و باسی ڕاستیەکان بکا کە نابێ باس بکرێن. ئەمەیان لەوانەیە ڕاست بێ.

## پیانووی ناپەجێ

با بگەڕێینەوە لای بوونەوەرە مەریخییەکە،ئەو لەوانەیە لێی ببێ بە مەتەڵ کە بۆچی ساڵی 1985

ساڵی لووتکەی گەڕانەوەی بەربەریزمە لە سەردەمی ئێمەدا لەلایەن دوژمنە بەدەکانی شارستانیەت، مەبەست تیرۆریزمی نێودەوڵەتیە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئەو لێێ بۆتە مەتەڵ چونکە خراپترین کەیسەکانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی لە ناوچەکە بەناو قوڵایی یادەکانمان ڕووچووە، وەکو تیرۆریزمی نێودەوڵەتی لە ئەمەریکای ناوەڕاست و زۆر کەیسی تریش، لە ڕاستیدا ئەوانەی ئێستاش.

هەر چەندە ، هەندێ کەیس لە 1985 دێنەوەبیر، باش بەبیردێنەوە،چونکە ئەوان تیرۆریزمن. خەڵاتی فەرمی تیرۆریزم بۆ ئەو ساڵە دەدرێت بە ڕفێنەرانی کەشتی ئەکیلی لاورۆ و کوشتنی ئەمەریکاییەکی خاوەن پێداویستی تایبەت، لیۆن کلینگۆڤەر. هەمووتان ئاگاداری ئەو ڕووداون. لە ڕاستیدا، ئەمە تاوانێکی دڕندە بوو. ئێستا تاوانبارانی ئەم تاوانە گوتیان ئەمە تۆڵەسەندنەوە بوو بۆ تەقینەوەکەی تونس کە هەفتەیەک پێشتر ڕوویدا، کە نموونەی کەیسێکی زۆر خراپی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی بوو،

بەڵام بەهەق ئێمە ئەم بیانووەمان ڕەتکردەوە، بەو ڕقەی کە شایانیەتی.

هەموو ئەوانەش کە خۆیان بە ترسنۆک و دووڕوو دانانێن، بەرامبەر هەموو کارە توندوتیژیەکانی تۆڵەسەندنەوە هەمان هەڵوێستی مەبدەئییان دەبێ، بۆ نموونە شەڕی ئەفغانستان، بەبیرتانە کە کرا و بە ڕوونی پێشبینی دەکرا کە لەوانەیە ملیۆنان خەڵک بگەیەنێتە لێواری برسێتی. وەکو من گوتم، ئێمە چ جاران نازانین. بە هۆی هۆکاری مەبدەئیەوە.

یان تاوانی سووکتر، وەکو تۆڵە سەندنەوەکانی ناوچە داگیرکراوەکان لە لایەن ئیسرائیلەوە بە پشتیوانی تەواوی وڵاتە یەککرتووەکان، وەکو هەموو جاران، کەواتە ئەوانە تیرۆریزم نین، مەریخیەکە بە تەکەزیی لە لاپەڕەی یەکەمدا دەنووسێ کە وڵاتە یەککرتووەکان ئا ئێستا بیانوی شەڕی دژی تیرۆر بەکاردێنێ بۆ پاراستن و لەوانەشە هەڵکشاندنی تیرۆریزم لە لایەن وڵاتی لایەنگری یەکەمیەوە.

دوا گەڕی ئەمە لە 1ی تشرینی یەکەمی 2000 دەستیپێکرد، لە ڕۆژانی سەرەتای پاش سەرهەڵدانی ئینتیفازە، هەلیکۆپتەرە ئیسرائیلیەکان دەستیان پێکرد بە مووشەک هێرش بکەنە سەر فەلەستینیە بێچەکەکان، بە دەرزەن خەڵکیان لەوان کوشت و بریندارکرد، هیچ بیانوویەکی بەرگری لە خۆکردن نەبوو [تێبینیەکی لاچەپ: کە ئێوە دەستەواژەی "هەلیکۆپتەری ئیسرائیلی" دەخوێننەوە، دەبێ ئەوە بزانن کە ئەوە مانای هەلیکۆپتەری ولاتە یەکگرتووەکانە بە فڕۆکەوانی ئیسرائیلی، کە دراون بە ئیسرائیل و دەشیانزانی کە ئەمە بۆچی دێتە بەکارهێنان].

کلینتۆن بۆ ئەم تاوانە دەسبەجێ کاردانەوەی هەبوو. لە 3ی ئۆکتۆبەری2000 ، دوو ڕۆژ دوای ئەوە، ئەو گەورەترین باری هەلیکۆپتەری سەربازی لە ماوەی دە ساڵدا بۆ ئیسرائیل نارد، لەگەڵ پارچەی یەدەگ بۆ هەلیکۆپتەرە هێرشبەرە ئەپاچیەکان کە لە ناوەڕاستی سپتێمبەر ناردرا بوون. ڕاگەیاندنیش هاریکاری

ئەمەی کرد بەوەی ڕەتیکردەوە بە هیچ شێوەیەک باسی ئەوە بکات، نەک نەیتوانی بەڵکو ڕەتیکردەوە؛ چونکە ئاگاداری هەموو ئەمانە بوون .

مانگی ڕابردوو، بێگومان، ڕۆژناماکانی مەریخ بەشداری واشنتۆنیان لە هەڵکشانی بازنەی تیرۆر کردۆتە سەردێڕی خۆیان. لە 14ی کانونی یەکەم، وڵاتە یەکگرتووەکان دژی بڕیارێکی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی ڤیتۆی بەکارهێنا کە بانگەوازی جێبەجێکردنی پێشنیازی میچێڵی[39] دەکرد بۆ ناردنی چاودێری نێودەوڵەتی بۆ چاودێریکردنی کەمبوونەوەی توندوتیژی. لەهەمانکاتدا نێردرا بۆ ئەنجومەنی گشتی کە لەوێ لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیل دژایەتی کرا، بەم جۆرە بزر بوو . ئێوەش دەتوانن سەیری ڕوماڵەکان بکەن.

---

[39] ڕاپۆرتی میچێل، ڕاپۆرتێکە لە کانوونی دووەمی 2000 خراوەتە بەردەم ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بۆ چارەسەرکردنی توندوتیژی نێوان ئیسرائیل و فەلەستین. ئەم ڕاپۆرتە لەلایەن کۆمیتەی شەرمەلشێخ بۆ دۆزینەوەی ڕاستیەکان ئامادەکراوە کە لەلایەن سیناتۆری ئەمەریکایی جۆرج میچێل سەرۆکایەتی دەکرا.

هەفتەیەک پێشتر، کۆنفرانسێک لە جنێڤ هەبوو بۆ لایەنە سەرەکیەکانی کە لەسەر پەیمانی جنێڤی چوارەم واژوویانکردووە، ئەوان بە ڕێزدانان بۆ ئیمزاکەیان ناچارن کە داوای جێبەجێکردنی بکەن. ئەم پەیمانە وەکو دەزانن لە دوای شەڕی جیهانی دووەم دامەزرا بۆ بە تاوان ناساندنی تاوانکاریەکانی نازیەکان. ئەم پەیمانە بەبێ دوودڵی هەموو ئەو کارانە قەدەغە دەکا کە ولاتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیل لە ناوچە داگیرکراوەکان ئەنجامی دەدەن، بە مۆڵگە نیشتەجێکانیشەوە کە بە بودجە و پشتیوانی تەواوی ولاتە یەکگرتووەکان دروستکران و فراوانکران و لە سەردەمی کلنتۆن[40] و باراک[41] لەکاتی دانوستانەکانی کامپدێڤد زیادکران. ئیسرائیل بە تەنها ئەو لێکدانەوەیە ڕەتدەکاتەوە.

کە ئەم بابەتە لە ئۆکتۆبەری 2000 خرایە بەردەم ئەنجومەنی ئاسایش، ولاتە یەکگرتووەکان دەنگی

[40]بیل کلنتون (1946-ئێستا 72 ساڵە)، سەرۆکی چل و دووەمی ئەمەریکا.
[41]باراک ئۆباما (1961- ئێستا 57 ساڵە)، سەرۆکی چل و چوارەمی ئەمەریکا.

نەدا، نەیویست ڕاستەوخۆ بەرامبەر پێشێلکردنی بنەما سەرەکیەکانی یاسای نێودەوڵەتی بوەستێتەوە، بە تایبەتیش ئەگەر کەشوهەوای داڕاشتنی بڕیارەکە لەبەرچاو بگیردرێ. بەو جۆرە ئەنجومەنی ئاسایش بە ڕێژەی چوارده بەرامبەر هیچ دەنگیدا بۆ داواکاریکردن لە ئیسرائیل کە ڕێز لە پەیمانەکە بگرێ، بەڵام دیسان بەزەقی دەشکێندرا. بەر لە کلنتۆن، وڵاتە یەکگرتووەکان و ئەندامەکانی تر دەنگیان بە لۆمەکردنی "شکاندنی زەقی" ئیسرائیل بۆ پەیمانەکە دا. ئەمەش هاوئاوازە لەگەڵ پڕاکتیزەکردنی کلینتۆن بۆ بەتاڵکردنەوەی یاسای نێودەوڵەتی و بڕیارە پێشوەکانی یوئێن دەربارەی ئیسرائیل و فەلەستین.

ڕاگەیاندن پێمان دەڵێت کە عارەب باوەڕیان وایە کە پەیمانەکە ناوچەکان دەگرێتەوە، کە هەڵەش نیە، هەرچەندە جۆرێک لە کەنارکردنی عارەب و خەڵکی تریش هەیە. دانیشتنەکەی 5ی کانوونی دووەمی 2001 کە هەموو یەکێتی ئەوڕوپا بەشداریانکرد،

تەکەزیان لەسەر نایاسایی نیشتەجێکردن و ئەوە کردەوە کە پێویستە ئەم پەیمانە لەسەر ناوچەکان جێبەجێ بکرێت، داوا لە ئیسرائیل کرا، واتە وڵاتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیل، کە ئاگایان لە یاسای نێودەوڵەتی هەبێ. وڵاتە یەکگرتووەکان بایکۆتی دانیشتنەکەی کرد، واتە کوشتی. دیسان دەتوانن ڕوماڵەکان سەیربکەن.

ئەم کردارانە بوونە هۆی هەڵکشانی تیرۆریزم لەوێ، بە شێوازە هەرە خراپەکەشی، ڕاگەیاندنیش بە ڕێگا ئاساییەکەی خۆی بەشداری کرد.

## وەڵامدانەوەی تیرۆریزم

لە کۆتاییدا، وادابنێ کە ئێمە لە تەک چاودێرە مەریخیەکە دەبین و لە پەیمانە ڕادیکالیەکە دوور دەکەوینەوە، بنەما ڕەوشتیە ڕاستەکان قبوڵدەکەین. ئەگەر ئێمە بگەین بەو ئاستە باڵایە، ئەو کاتە ئێمە دەتوانین، تەنها ئەو کاتە، ڕاستگۆیانە ئەم پرسیارە

بوروژێنین کە وەڵاممان بەرامبەر تاوانەکانی تیرۆر چۆن بێ.

یەکێک لە وەڵامەکان ئەوەیە کە سەیری پێشینەی وڵاتێکی پابەند بە یاسا بکەیت، پێشینەی نیکاراگوا بۆ نموونە. بێگومان ئەوە سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا، چونکە ئەوان بەرامبەر ئەو ڕاستیە وەستانەوە کە جیهان بە هێز حوکم دەکرێ نەک بە یاسا، بەڵام بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان فەشەل نابێ. من لەو هەموو ڕوماڵە فراوانەی چەند مانگی ڕابردوودا یەک دێڕم نەبینی کە باسی ئەو پێشینەیە بکا .

وەڵامێکیتر لە لایەن بۆش و بۆیس درایەوە، بەڵام ئێمە یەکسەر ئەمە ڕەتدەکەینەوە، چونکە کەس باوەڕ بەوە ناکا کە هایتی، نیکاراگوا ،کوبا و لیستێکی درێژی ئەو وڵاتانە لە سەرتاسەری جیهان مافی ئەوەیان هەبێ کە هێرشی تیرۆرستی فراوان دژی وڵاتە یەکگرتووەکان و لایەنگرانی یان وڵاتە دەوڵەمەند و بە هێزەکانی تر ئەنجام بدەن.

وەڵامی ماقوڵتر لە لایەن چەند سەرچاوەی ترەوە پێشکەشکران، لەناویاندا ڤاتیکان، کە لەلایەن مێژوونووسی سەربازیی ئەنگلۆ-ئەمەریکایی بەناوبانگ میکائیل هاوارد[42] لە تشرینی دووەمی ڕابردوو خرایەڕوو. لە ژمارەی ئێستای گۆڤاری فۆرن ئەفێرز (کانونی دووەم-شوبات 2002) بڵاوکرایەوە، ئەمە گۆڤاری دەزگای دەسەڵاتە. ئێستا هاوارد هەموو متمانەیەکی هەیە، زۆر سامی هەیە، ئەو زۆر سەرسامە بە ئیمپراتۆریەتی بەریتانی، هەروەها پتریش بە جێنشینەکەی لە حوکمکردنی جیهاندا، بۆیە ناتوانرێ ئەو بە تاوانی "ڕێژەگەری لە بیروباوەڕ" و ئەو جۆرە تاوانانە تاوانبار بکرێ. سەبارەت بە11ی سێپتێمبەر، ئەو پێشنیازیکرد کە کردەوەیەکی پۆلیسی دژی پیلانگێڕیی تاوانکاریی ئەنجام بدرێ، ئەندامەکانیان بگیرێن و ڕاپێچبکرێنە بەردەم دادگایەکی نێودەوڵەتی، کە لەوێ دادگاییەکی

[42]میکائیل هاوارد (1922-ئێستا 96ساڵە)، پرۆفیسۆری مێژووی شەڕ لە زانکۆکانی ئۆکسفۆرد و ییل و مێژوونووسێکی سەربازی بەریتانیە. تایمس بە مەزنترین مێژوونووسی داناوە کە ئێستا لەژیاندابێ.

دادپەروەرانە وەربگرن و ئەگەر تاوانبار دەرچوون ئەوا سزای شایان بدرێن. ئەمە بیری لێنەکرایەوە، لەکاتێکدا لەلای من جۆرێکە لە باش. ئەگەر باش بێ، ئەوا لەسەر تاوانی تیرۆریستی خراپتریش جێبەجێ دەکرێ. بۆ نموونە، هێرشی تیرۆریستی نێودەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکان دژی نیکاراگوا یان لەوەش خراپتر کە لێرەولەوێ تا ئێستاش دەدۆمینێ. ئەمە هەرگیز بیری لێنەکرایەوە، بێگومان، لەبەر هۆکاری پێچەوانەوە.

ئیتر ڕاستگۆیی گرفتمان بۆ دروستدەکا. وەڵامی ئاسان بریتیە لە دووڕوویی. بژاردەی تر ئەوەیە کە لە لای برادەرە مەریخییەکەمانە، ئەو کەسەی بە خۆبەڕاستزانینی مەزنەوە بەو مەبدەئانەی کە ئێمە بڕوامان پێیەتی، پابەند دەبێ . هەرچەندە ئەم بژاردەیە لەوە زەحمەتترە کە بەهەند وەربگیردرێ، بەڵام گرنگە، ئەگەر بویسترێ جیهان لە کارەساتی هێشتا خراپتر دووربخرێتەوە.

## نووسەری پرۆفیسۆر نەعوم چۆمسکی

دکتۆر نەعوم چۆمسکی یەکێکە لە بەناوبانگترین زمانەوان و شیکەرەوەی سیاسی لە جیهان. دکتۆرای لە زانکۆی پەنسلڤانیا لە بواری زمانەوانی وەرگرتووە و لەوەتەی ساڵی 1955پرۆفیسۆرە لە پەیمانگای ماساشوتس بۆ تەکنۆلۆجیا ئێم ئای تی. بیردۆز و توێژینەوەکانی لە بواری زمانەوانی خاڵی وەرچەرخانن لەو زانستەدا بۆ تێگەیشتنی تواناکانی مرۆڤ بۆ گەشەی زمان. ئەو زانستی زمانی لە زانستێکی مرۆڤایەتیەوە گۆڕی بۆ زانستێکی سروشتی. لە بوارەکانی فەلسەفەو سیاسەتدا، ڕۆڵی زۆر مێژوویی گێڕاوە لە ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە دیدوبۆچوونی خوێندەواراندا لەسەرتاسەری جیهان. لەهەردوو بوارەکەدا، نووسینەکانی پڕخوێنەرترینن لە مێژوودا. دەیان خەڵاتی وەرگرتووە بۆ ناسینەوەی ڕۆڵی ئەو لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. ئێستا یەکێکە لە ئایکۆنەکانی مرۆڤایەتی لەسەرگۆی زەوی.

## وەرگێڕ پرۆفیسۆر ابراهیم حەمەڕەش

دکتۆر ابراهیم حەمەڕەش، پرۆفیسۆری ئەندازیاری کارەبا و هاوڕێی نزیکی چۆمسکی، بەکالۆریۆسی لە زانکۆی سەلاحەدین، ماستەری لە زانکۆی موسڵ، دکتۆرای لەزانکۆی تەکنۆلۆجی و بزنسی لە زانکۆی سان دیاگۆی کالیفۆرنیا و پۆستدکتۆرای لە زانکۆی مۆناشی ئوسترالی خوێندووە. تا ئێستا سی و چوار توێژینەوەی لە گۆڤارە بەناوبانگەکانی جیهان بڵاوکردۆتەوە. لەدەیان کۆنفرانسی نێودەوڵەتی لە ئەمەریکا و ئوسترالیاو بەریتانیاو کۆریاو مالیزیاو وڵاتانی تر قسەکەری سەرەکی بووە، مەدالیای ئیندۆڤەری حکومەتی ئوسترالی لە پای کارەکانی لە بواری توێژینەوەی ئەندازیاری لە ئوسترالیا پێبەخشراوە. سەرپەرشتی دەیان قوتابی ماستەرو دکتۆرای کردووە. سەنتەری فێرکردنی ووزەی نوێبووەوەی لەگەڵ زانکۆ کالسرۆی ئەڵمانی و سەنتەری ڕۆبۆتی لەگەڵ زانکۆی فلۆریدای ئەمەریکایی دروستکردووە. یەکەم کتێبی وەرگێڕاوی لە ساڵی 1991 چاپکردووە. ئێستا پرۆفیسۆرە لە زانکۆی سەلاحەدین-هەولێر.

هەندێك ڕستەی ناو ئەم كتێبە:

"ڕێكخستن كاریگەری خۆی هەیە. ڕێكخستن مانای ئەوە دەگەیەنێ كە تۆ ووریایت لەوەی بەتەنها نیت و خەڵكی تریش هەیە وەك تۆ بیر دەكەنەوە"

"پروپاگەندە لە دیموكراسیدا هەمان كاری قامچیەكە دەكا لە دەوڵەتی تۆتالیتاریدا"

"ئایا ئێمە دەمانەوێت لە ژێر چ ڕادەیەك لە فۆرمی تۆتالیتاریای خۆسەپێنەر بژین، كە تێیدا مێگەلە سەرلێشێواوەكە پەراوێز خراوە، ئاراستە كراوە،زەندەقی ڕژێندراوە، سلۆگانی نیشتیمانی دەڵێتەوە، لە ژیانی خۆی دڵنیا نیە، سەرسامە بە سەركردەكەی كە ئەویان پاراست لە فەوتان، لەوكاتەشدا كۆمەڵی خوێندەواران بە فەرمان، قاز-ئاسا ڕیزكراون و ئەو دروشمانە دووبارەدەكەنەوە كە لێیان چاوەڕواندەكرێ بیڵێنەوە، كۆمەڵگاش لە ناوەوە دەڕوخێت"

نەعوم چۆمسكی




